زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان

ئەلقەی هەشتەم

عەلی باپیر

# خوو ڕەوشتی بەرز و پەسند

# سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتی یە






بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن





# خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند

# سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتی یە

# خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند

# سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتی یە



عەلی باپیر




بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

ناوی کتێب: خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتی یە
نوسەر: عەلی باپیر
بڵاوکردنەوەی نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن/ هەولێر
خەت: نەوزاد کۆیی
بەرگ: أمين مخلص
ساڵی چاپ: 1428 ك – 2007 ز
تیراژ: 3000 دانە
سەرپەشتی چاپ: نەهرۆ محمود

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی ( 283 ) ی ساڵی 2007 دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل: ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

www.al-tafseer.com

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿ ن وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ ۞ مَا أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ
وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ ۞ وَإِنَّ لَكَ لَأَجْراً غَيْرَ مَمْنُونٍ ۞

( القلم 1-4)

# پێشكەش بێ

بەو كەسانەی كە هەردەم‌و بێ پسانەوە هەوڵدەدەن، ڕەوشتی خۆیان وەك هی پێغەمبەری خوا ﷺ لێ بكەن‌و لە هەموو هەڵسوكەوت‌و وردو درشتێكدا شوێن پێی هەڵدەگرن و چاوی لێ دەكەن .

# پێشەكی

الحمدلله الكبير المتعال والصلاة والسلام على محمد والآل

خوێنەری بەڕێز !

ئەم نامیلكەیەی بەردەستت لە ئەسڵدا وتارێك بووە كە لە ئێوارە كۆڕێكدا دراوە لە شارۆچكەی ( قەزای سۆران) لە ڕۆژی (22)ی (مانگی ڕەمەزان)ی ئەمساڵ (1427ك) پا شان هێنراوە تە سەر كاغەزو(1) دوای پێدا چوونەوە بەم شێوەیەی لێهاتوە .

دیارە بابەتی خووڕەوشت (أخلاق)یش- بەتایبەت لەم ڕۆژ گارەدا كە تەوژمی دنیا پەرستیو ماددی گەراییو شوێن ئارەزوو كەوتن زۆری پەرەستاندوە- یەكێكە لەبابەتە گەورەو گرن گەكانو جێی خۆیەتی لە هەموو ئاستەكانەوە پشكی شێری هەبێ لە گرن گیو بایەخ پێدران بەتایبەت لەنێو گەلێكی وەك كوردا كە دەیەوێ لەسەر پێی خۆی بوەستێو بەرەو هەواری ڕزگارییو ئازادییو خاوەنی كیانو بوونی خۆی بچێت!

---

(1) لە لایەن (محمد)ی كوڕمەوە خوا سەلامەت و سەربەرزی بكات

چونكە شتێكی ڕوونو بێ پێچو پەنایە كە خوو ڕەو شتی بەرزو پەسند لە ژیانی كۆمەڵگادا وەك جومگەو ژێیەكان وایە بۆ جەستەو، هیچ خەڵكو كۆمەڵگا یەك ناتوا نێ ژ یانێكی ساغو سەلیمو بەختەوەرانەی هەبێ، بەبێ خۆڕازاندنەوەی تاكەكانی بەو ڕەو شتو بەها بەرزو پەسندانەی كە هەموو پێغەم بەران (ع لیهم ال صلاة والسلام )و سەرجەم عاقڵ مەندانی دون یاو هەوڵی بڵاوكرد نەوەو ڕەواج پێدانیان داونو هاوكات لەگەڵ بەرجەستە كردنیان لەخۆیان دا خەڵكیشیان بۆ هانداون .

بە هیوای ئەوەی كە خەڵكی كورد ستانی ئێ مەش بە هەموو ئاستەكانو سەرجەم توێژەكانی یەوە هەم پارێز گاری لەو ئەدەبو ڕەوشتە جوانو پەسندانە بكات كە ماونیو هەم هەوڵی هێنا نەوەو گێڕانەوەی ئەوانەش بدات كە بە هەر هۆیەكەوە بووە لەنێو زۆر بەی یان هەندێكیدا فەوتاونو نەماون .

پێویستە هەموو لایەكیشمان ئەو ڕاستییە مەزنە بێنینە بەرچاوی خۆمان كە ئامانجی بنەڕەتیو سەرەكی شەریعەتی خوای كار بەجێو بەبەزەیی (تبارك وتعالی) بریتیە لە: (خێرو خۆشیو بەخ تەوەری) خەڵكی كە لە دوورخستنەوەی زیانەكانو دابینكردنی بەرژەوەندییەكان (دَفع المضار وجلب المصالح )دا خۆی دەنوێنێ، بۆ یە: هەر هەوڵو

هەنگاوێك كە ببێتە مایەی هێنا نەوەی ئەو ئا مانج و مەبە ستە گەورەو گرنگە بەبەشێك لە دینداریی‌و طاعەت‌و عیبادەت لە قەڵەم دەدرێ، خوای بەخشەرو بەخشندەش فەرموویەتی:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا وَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ وَافْعَلُوا الْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ (الحج-77) ، واتە: ئەی ئەوا نەی ئیماند تان هێ ناوە ڕكووع ببەن‌و كڕنۆش بەرن- بۆ خوا- و پەروەردگارتان بپەر ستن‌و چاكە بكەن بەڵكو سەرفراز بن.

سبحان ربك رب العزة عما يصفون وسلامٌ على المرسلين
والحمدلله ربّ العالمين

2006/11/14 - 1427/10/22 هەولێر

# ڕێخۆشکردن

خوێنەری سەنگین !

ئەم نامیلکەیە بۆ شەش تەوەرە دابەش بووە بەم ناونیشانانەی خوارێ:

تەوەرەی یەکەم: پێناسەی خوو ڕەوشت بەگشتی .
تەوەرەی دووەم: پلەو پایەو گرنگی خووڕەوشتی بەرزو پەسند .
تەوەرەی سێیەم: پەیوەندی نێوان خووڕەوشتی بەرزو پەسندو ئیمان .
تەوەرەی چوارەم: بەرهەمی خووڕەوشتی پەسند لە دنیاو دوارۆژدا .
تەوەرەی پێنجەم: ڕێگاو چۆنیەتی وەدەستهێنانی خووڕەوشتی جوانو پەسند.
تەوەرەی شەشەم: جۆرەکانی خووڕەوشتی بەرزو پەسند.

ئاشکراشە کە توێژینەوەی بابەتێکی گرنگو گەورەی وەك خووڕەوشت لە دوو تویی وتارو نامیلکەیەکداو هەقی خۆی پێدانی شتێکی مەحاڵە، بەڵام وەك گوتراوە: ئەوەی فریای هەموو نەکەوێ نابێ زۆربەی یان هەندێکیشی وازی لێ بهێنرێ: (مالا يدرك كله لا يترك جله أو بعضه ).

شایانی باسیشە کە ئێمە کتێبێکی سەربەخۆمان بۆ توێژینەوە دەربارەی خووڕەو شت (أخلاق) بە ناوونیشانی: (خووڕەو شتی ئیسلامیی) لەبەردەستەو، لە خوای بەخششو بێسنوور لە هەڵەو پەڵە دوور، داواکارم لە داهاتوویەکی نزیکدا پێداچوونەوەو خستنە ژێر چاپیمان بۆ ئاسان بکات .

# ســەرەتــای وتــارەکــە

الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونستهديه ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له و من يضلل فلا هادي له وأشهد أن لا اله الا الله وحده لاشريك له وأشهد أن محمداً عبده ورسوله، اللهم صل وسلم وبارك عليه وعلى آله أجمعين من الصحب والازواج والقرابة والتابعين لهم بأحسان الى يوم الدين .

برایانو خوشکانی خۆشەویستی ( قەزای سۆران)

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

دیارە ئەمڕۆ (22)ی مانگی ڕەمەزانی پڕ پیتو پیرۆزە، بۆیە من لەم کۆڕەمدا بابەتێکم بۆ ئامادەکردوون کە لەگەڵ کەشو هەوای مەعنەوییو ڕووحانیی مانگی موبارەکی ڕەمەزاندا گونجاوە، ئەویش ناوونیشانەکەی بەم شـــێوەیەیە (خووڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتیی یە ) .

بەڵێ، مسوڵمانەتیو دینداریی قسەیەك نیە بەس بەدەم بگوترێ، یان ناوونیشانێك بێ هەڵبواسرێ، وە مسوڵمانەتی تەنیا شتێكو دوو شت نیە، بەڵکو زۆر ڕەهەندو لایەنی هەنو ئەگەر بمانەوێ بە ڕستەیەکی کورت پێناسەی بکەین، دەبێ بڵێین :-

(مسوڵمانێتی واتە پابەندیی بەشەریعەتی خوای پەروەردگارەوە لە ژیانی تاکییو خێزانییو کۆمەڵایەتیما ندا) بەڵام ئەوەی کە مسوڵمانێتیو دینداریی ئینسانی پێ لە مەحەك دەدرێو پێی کێشانە دەکرێ بریتیە لە خووڕەوشتی بەرزو پەسند، جا من خوای بەخشەرو پشتیوان بێ، لە شەش خاڵاندا باسی خووڕەوشتی مسوڵمان دەکەم:

1- سەرەتا پێناسەی خووڕەوشت دەکەین، کە بەگشتی خووڕەوشت (أخلاق) یانی چی؟!،

2- دوایی باسی پلەو پایەو گرنگی خووڕەوشتی بەرزو پەسند دەکەین.

3- پاشان باسی پەیوەندی نێوان خووڕەوشتی بەرزو پەسندو ئیمان دەکەین.

4- دوایی باسی بەرهەمی خووڕەوشتی بەرزو پەسند دەکەین لەدنیاو لە دوارۆژدا.

5- ئینجا باسی چۆنیەتی وەدەستهێنانی خووڕەوشتی پەسندو جوان دەکەین.

6- وە لەکۆتاییشدا باسی جۆرەکانی خووڕەوشتی بەرزو پەسند دەکەین .

# دەستپێك

لە دەستپێکی بابەتەکەمدا دەمەوێ ئەوەتان عەرز بکەم، کە ئەمڕۆ میللەتی ئێمە، لە زۆر ڕووەوە خوای پەروەردگار دەرووی خێری لێ کردۆتەوە، بەڵام لەڕاستیدا کەمتر وابووە کە ئێمە سوپاسی خوای بەخشەر (تبارك وتعالى) بکەین و ئەو نیعمەتانە لە ڕەزامەندیی خوای پەروەردگاردا بەکار بێنین، تاکو خوای بەبەزەیی ئەو نیعمەتانەمان بۆ زیاد بکاتو هی دیکەشمان پێ ببەخشێ، چونکە خوای کاربەجێ گفتو بەڵێنی داوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ﴾ (ابراهيم-7) واتە: (وە یاد بکەنەوە کاتێك پەروەردگارت ڕایگەیاند ئەگەر سوپاسم بکەن لەسەر نیعمەتەکان بۆتان زیاد دەکەم ....) بۆیەش زانایان گوتویانە: (الشكر سياج النِّعم)، واتە: سوپاسکردنی خوا پەرژینە بۆ نیعمەتەکان، ئنجا خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ﴾، واتە: بەڵام ئەگەر نا سوپاسبن بەرامبەر بە چاکەکانی من، ئەوە سزای من توندە، یانی نیعمەتەکانتان لێ دەستێنمەوەو سزاتان دەدەم، واتە: لە دونیادا نیعمەتەکانتان لێ دەستێنمەوەو لە دوا ڕۆژیشدا سزاتان دەدەم، کە بۆچی لە دونیادا بە

سوپاس (شکر)کردن پێشوازیتان لە نیعمەتەکانی من نەکرد؟! چا یەکێك لەو لایەنانەی ژیانی گەلەکەمان کە ئێمە هەمووماں تێیدا کەمتەر خەمین، لە سەرێڕا هەتا خوارێ بە سەرکردایەتی سیاسی و فیکرییەوە، بە حکومەتەوە بە زاناو پێشەوایانو ڕاگەیاندنو ئەهلی قەڵەمەوە، بە حیزبەکانەوەو بە هەموو لایەکەوە بریتییە لە لایەنی ئەخلاقو ڕەوشت، (ئەحمەد شەوقی)ی شاعیری ناودار لەوبارەوە شێعرێکی جوانی هەیە کە دەڵێ:

( وأنما الأمم الأخلاق ما بقيت فأن هموا أخلاقهم ذهبت ذهبوا )

یانی: میللەتان بریتین لە ڕەوشتی بەرزو جوان هەتا ڕەو شتیان بمێنێ دەمێننەوە بەڵام هەرکات ئەخلاق ورەو شتیان لەدەستدا بۆ خۆشیان دەڕۆن، خوای پەروەردگاریش لە قورئاندا ئەو ڕاستییەی زۆر بەڕوونی بۆ بەیان کردووین کە دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُواْ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيراً ﴾ (الاسراء -16).

لێرەدا خوای دادگەر (عزّو جلّ) یا سایەکی خۆیمان بۆ ڕوون دەکاتەوەو دەفەرموێ: (هەرکاتێك ویستمان شارێك، کۆمەڵگایەك لەنێوبەرین خۆشگوزەرانەکانی فەرمان پێ دەکەین بە چاکە کردن، بەڵام ئەوان خراپەو تاوان دەکەنە پیشە لە جیاتی ئەو چاکەکاری یەی کە فەرمانمان پێ کردوون، سەرەنجام هەرەشەی خوایان لە سەر پێویست دەبێو کاولی دەکەین)، خوای کاربەجێ لە گەڵێ شوێنی

قورئاندا ئەو حەقیقەتەی بەیانکردوە کە میللەتان لە ئەنجامی زیادەڕۆییکردن لە خۆ شگوزەرانیداو بەهۆی دارووخانی ڕەوشتو ئاکاریانەوە شایستەی ئەوە دەبن کە خوای دادگەر سزایان بدات.

جا خوشكو برایانی بەڕێزم!

بێگومان ئێمە وەك کەسانێکی مسوڵمان بەرپرسیارین بەرامبەر خەڵكو وڵاتی خۆمان بۆیە پێویستە چیمان لەدەست دێ لەوبارەوە بیکەین، هەرکەسە بە پێی بۆلوانو توانای خۆی بەمەبەستی پارێزگاری لێکردنی خووڕەوشتی خەڵکەکەمانو پاراستنی لە دارووخان، چونکە بەڕاستی خووڕەوشت هەوێنی ژیانی میللەتو کۆمەڵگایەو ڕووحێکە هەرکاتێك ئەو ڕووحە لە هەر میللەتو کۆمەڵگایەکدا نەما، ئەو خەڵكو کۆمەڵگایە بۆگەن دەکاو گەندەڵو پووچەڵ دەبێ، ئەوەش ڕاستییەکی ڕوونو حاشا لێنەکراوی ئیسلامیی یەو لە ژیانی میللەتانو شارستانێتییەکانیشدا بەر چاوو دیارە، چونکە هەموو شارستانێتییەکانی پێشوو: میسرییەکان، یۆنانییەکان، فارسو ڕۆمەکانو ... تەنانەت شارستانێتی دەوڵەتی ئیسلامیش، هەموویان کاتێك ڕووخاون، کە لە ڕووی ئەخلاقو ڕەوشتەوە بە تایبەتی لە بواری جینسیو پەیوەندی نێوان پیاوانو ئافرەتاندا، زیادەڕۆییان کردوەو تێیان پەڕاندوەو دووچاری گەندەڵییو قرپۆکیی بوونو هەرەسیان هێناوە، بە دانپێداهێنانی هەموو مێژوونووسان بە مسوڵمانو نامسوڵمانەوە، هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە هیچ کام لەو دەوڵەتانە لەبەر کەمدەرامەتیی، یاخود

کەم هێزیی نەڕووخاون، بەڵکو لەبەر داڕووخانی ڕەوشتیان هەرەسیان هێناوە، ڕەوشت بە ماناو چەمکی فراوانی وەك دوایی باسی دەکەین .

جا من بە پێویستم زانی کە لەم کۆڕەدا تیشك بخەمە سەر ئەو بابەتە وەك هەنگاوێك بۆ خەمخواردن لە خەڵکە مسوڵمانەکەمان کە بەداخەوە کۆمەڵێك هەڵس‌و کەوت‌و ڕەفتاری ناشیرین لەنێو بەشێکیدا پەیدابوونەو زەق بوونەتەوەو خەریکە پەرەش دەسێنن‌و تەشەنەش دەکەن، دیارە ئێمەش خۆمان بە بەرپرسیار دەزانین بەرامبەر بە خووڕەوشتی میللەتی خۆمان کە نەهێڵین ئەو ڕەفتارو هەڵس‌وکەوتە دزێوانە تەشەنە بکەن، چونکە ئەوانە دەردو نەخۆشی‌و گیاکەڵەن‌و لەسەرمان پێویستە زۆر بە وریایی‌و گورج‌و گۆڵی ڕیشەکێشیان بکەین‌و نەیانهێڵین بەڵکو زیاد لەوەش هەوڵ بدەین کۆمەڵگایەکەمان برازێنینەوە بە ڕەوشتی بەرزو جوان تەنها بە پاکسازیی لێی نەگەڕێین‌و چاکسازیشی بکەین، ئێستاش با بچینە سەر تەوەری یەکەمی باسەکەمان .

أ- سەرەتا با بزانین وشەی (أخلاق) كە لە زمانی كوردیدا (خووڕەوشت)ی بۆ بەكاردێت یانی چی؟!

ب-دیارە وشەی (أخلاق) وشەیەكی عەرەبی یەو كۆی (خُلُق) یان (خُلْقْ) واتا ڕەوشت جا هەرچەندە ئێمە لە زمانی كوردیدا نالێین خووڕەوشتەكان، بەڵام لە زمانی عەرەبیدا (خلق) بە (أخلاق) كۆدەكرێتەوە، (راغب الاصفهانی) كە یەكێكە لەو زانایانەی زۆر لە مانای وشەكانی قورئان دەكۆڵنەوە لەوبارەوە دە لێ: (الخَلْقُ والخُلْقُ في الأصل واحدٌ كالشَّرْب والشِّرب والصَّرمِ والصِّرم لكن خُصّ الخَلْقِ بالأشكال والصور المدركة بالبصر وخَصَّ الخُلُقُ بالقوى والسجايا المدركة بالبصيرة)، واتە: لە ئەصڵدا (خَلْقْ)و (خُلُقْ) یەك ڕیشەیان هەیە وەك (شَرْبْ و شُرُبْ) كە هەردووكیان بە مانای خواردنەوەن وە ( صَرْم و صرُمْ) كە هەردووكیان بە مانای برینن، بەڵام وشەی (خَلْقْ) تایبەتە بە ڕواڵەتی ئینسانەوەو بە ئەندامەكانیو بە شێوەی بەرهەستو بینراوی یەوەو وشەی (خُلُقْ)یش تایبەتە بەو سیفەتە پەنهانانەی كە بە عەقڵ دەبینرێن، هەروەها (ابن منظور)یش كە یەكێكە لە زانایانی زمانی عەرەبی دەڵێ: وشەی (خُلُقْ)ن (خُلْقْ) بە مانای سروشت (سجیَّة) دێ ، وە وشەی (خُلُقْ) بریتیە لە وەسفو پێناسەكردنێك بۆ دیوی نێوەوەی ئینسان وەكو چۆن (خَلْقْ) دیوی دەرەوەو بینراوی ئینسان وەسفو

پێناسە دەکات، بۆیە سوننەتە کاتێك تەماشای ئاوێنە دە کەی بڵێی: « الحمدلله اللهم كما حسنْتَ خَلْقي فَحَسِّنَ خُلُقي) (رواه ابن السِّني)، واتە: ستایش بۆ تۆ ئەی خوایە وەك چۆن جەستەت جوان کردووم ڕەوشتیشم جوان بکە. هەروەها خاوەنی (المعجم الوسيط) لە پێناسەی (أخلاق)دا گوتویەتی (الخُلُقُ حالٌ للنفسِ راسخة تَصْدُر عنها الافعال من خيرٍ أو شرٍ من غير حاجة الى فكر و رويّة)، واتە: (خُلُقْ) حاڵەتێكە دەروونی یە کە ئاكارو هەڵس وكەوتی پەسندی لێوە پەیدا دەبن بێ ئەوەی کە پێویست بە بیر لێکردنەوەو ڕامان بکات.

بەڵێ بەڕێزان!

سیفەتە بەرزو پەسندەكانی وەك: ڕاستگۆیی، ئازایەتی، دەستپاكی، بەخشندەیی، خۆ بەكەمگریی، دادگەری، بەزەیی .. هتد کاتێك دەبنە ڕەوشت و ئاكاری جێگیر کە ڕەگ و ڕیشەیان لە فیطرەت و دەروونی مرۆڤدا دادەكوتن و دەبنە بەشێكی پێكهێنەری. پێغەمبەریش (عليه الصلاة والسلام) لەوبارەوە فەرمایشتێكی هەیە کە تێیدا دەفەرموێ: ((الناس معادن كمعادن الذهب والفضة فخيارهم في الجاهلية خيارهم في الاسلام اذا فَقهوا)) (متفق عليه)، واتە (مرۆڤەكان وەكو كانزاكانی زێڕو زیو جۆراو جۆرن  لە ڕووی خووڕەوشتەوە  جا ئەوانەیان کە لە سەردەمی نەفامیدا باش بوون  واتە سیفەتی بەرزو پەسندیان هەبوون  لە ئیسلامیشدا هەر ئەوانە باشن مادام لە دیندا شارەزا بن) ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر

ﷺ حەقیقەتێکی گەورە دەخاتە ڕوو، ئەویش ئەوەیە کە ئاکاری بەرزو پەسند لە ئینساندا پەیوەندی بە بناغەی کەسایەتی ئینسانەوە هەیەو جاری وایە بابای کافر کۆمەڵە خەسڵەتو ڕەوشتێکی جوانی هەیەو بە پێچەوانەشەوە جاری وا هەیە ئینسان مسوڵمانیشە بەڵام چەند خەسڵەتو ڕەوشتێکی خراپی هەن، بە تەئکید هەرکات ئیمان بە تەواوی ڕەگو ڕیشە دابکوتێ هەموو ئاکارێکی ناپەسند لادەباتو دەسووتێنێ، بەڵام خووڕەوشتی بەرزو پەسند تایبەت نیە بە مرۆڤی مسوڵمانەوە، بەڵکو پەیوەندی بە فیطرەتی ئینسانەوە هەیە، لە فەرمایشتێکی دیکەدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ((ان الله قَسَّم أخلاقكم كما قَسَّم أرزاقكم)) (رواه أحمد)، واتە خوا (جل شأنه) ڕەوشتو خووی بەسەردا دابەشکردوون وەك چۆن بژیوەکانتانی دابەش کردوە، ئێستاش بۆ ئەوەی چەمكو واتای وشەی خووڕەو شت (أخلاق)مان زیاتر بۆ ڕۆشن بێتەوە با سەرنجی چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەین: پێغەمبەر ﷺ ڕەوشتی جوانی بەوە پێناسە کردووە کە دەفەرموێ: ((البِـرّ حُسنُ الخُلُقِ)) (رواه مسلم)، وشەی (البِـرّ) لە زاراوەی شەرعدا یانی مسوڵمانەتیو چاکە کاریی بە مانای فراوانیان، جا لێرەدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ چاکەکارییو مسوڵمانێتی بریتیە لە خووڕەو شتی جوان. خوای پەروەردگاریش لە قورئانی بەرێزدا وشەی (برّ)مان بە نۆزدە(19) خەسڵەت بۆ تەفسیر دەکاتو دەفەرموێ: ﴿لَّيْسَ الْبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَـكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ

وَالْمَلآئِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّآئِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُواْ وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاء والضَّرَّاء وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَـئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَـئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ﴾ (البقرة- 177).

لێرەدا خوای پەروەردگار وشەی (برّ)ی بۆ پێناسە کردووین بە نۆزدە(19) خەسڵەت، کە پێنجیان پێنج پایە سەرەکییەکانی ئیمانن: ئیمان بە خواو بە ڕۆژی دوایی، و بە فریشتەکانو بە کتێبەکانو بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)، وە شەشیان پەیوەندییان بە ماڵ بەخشینەوە هەیەو دوویان بریتین لە: بەرپاکردنی نوێژو زەکات دانو، یەکیان بریتیە لە: بەڵێن بردنەسەرو سێشیان پەیوەندی یان بە خۆڕاگرییەوە هەیە لەکاتی نەداریی و نەخۆشیو لە کاتی بەرەنگاربوونەوەو جەنگ لە گەڵ دوژمناندا، دووشیان بریتین لە: پارێزکارییو ڕاستگۆیی، کەواتە: کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((البرّ حُسْنُ الخُلُقْ)) مانای وایە مسوڵمانەتی هەمووی لە ڕەوشتی جواندا جێی دەبێتەوە.

ئنجا دایکمان عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) لەکاتێکدا کە پرسیاری لێ دەکرێ دەربارەی ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((کان خُلُقُه القرآن)) (رواه مسلم)، واتە: ئاکارو ڕەوشتی قورئان بوو، قورئان چۆن دەفەرموێ: ئەو ﷺ وایدەکرد.

فەرموودەیەکی دیکە لەوبارەوە ئەوەیە، کە (اسامة بن شریك) دەڵێ: پرسیار لە پێغەمبەر کرا ﷺ ((یارسول الله ما أفضل ما

أعطي المرءُ المسلم؟! قال الخُلُقُ الحسن)) (رواه أحمد والنسائي وأبوداود وابن ماجه)، واتە: ئەی پێغەمبەری خوا چ شتێك لە هەموو شتێك گەورەترو چاكترە، كە درابێ بە ئینسانی مسوڵمان؟! فەرمووی: ڕەوشتی بەرزو جوان، وە لە فەرمایشتێكی دیكەدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((ألا أدلكم على أكرم أخلاق الدنيا والآخرة؟ أن تَصِلَ مَنْ قَطَعَكَ وتُعْطِيَ مَنْ حَرَمَكَ وتَعفُوَ عَمَّنْ ظَلَمَكَ)) (رواه أحمد والطبراني والحاكم)، واتە: پێتان بڵێم كە بەڕێزترین‌و جوانترین ڕەوشتی خەڵكی دنیاو دوارِۆژ چیە؟ ئەوەیە كە سەردانی ئەو كەسە بكەی، كە پەیوەندیت لەگەڵ دەپچڕێنێ- پەیوەندی خزمایەتی‌و برایەتی‌و دراوسێتی،... هتد، یانی كە ئەو پشتت تێدەكات تۆ ڕووی تێبكەی، وە كەسێك كە تۆ بێبەش دەكات لە حەقی خۆت تۆ ئەگەر بووت ئەو بێبەش نەكەی لە حەقی خۆی، وە چاوپۆشی لە كەسێك بكەی كە ستەمی لێكردووی! كەواتە كەسێك خاوەنی ئەو خەسڵەتانە بێ ئەوە ڕەوشت بەرزترین كەسە لە دنیاو لە دوارِۆژدا، ئنجا پێویستە بزانین وشەی ڕەوشت (أخلاق) واتایەكەی فراوانەو بۆ هی خراپ‌و هی باشیش بەكاردێ، بەڵام لە كوردەواری خۆماندا كە دەڵێن: (ڕەوشت) بە زۆری بۆ مەدح بەكاردێ، بەڵام لە ڕاستیداو لە بەرامبەر هەر ڕەوشتێكی باش‌و پەسنددا ڕەوشتێكی خراپ‌و ناپەسند هەیەو بۆ جیاكردنەوەی ڕەوشتە چاك‌و خراپەكان لە یەكدی، پێویستە وشەی چاك بۆ جۆری یەكەم‌و خراپ بۆ جۆری دووەم بەكاربێت.

خوشكو برایانی بەڕێز، دەتوانین لە چوار خاڵـدا پـلەو پایـەو گرنگی خووڕەوشتی جوان بخەینە ڕوو:

## یەكەم: خووڕەوشتی بەرز ئیماندارانو بەندە چاكەكانو پارێزكارانی پێ وەسف و پێناسە كراون:

دیارە لەو بارەشەوە بەڵگەو نموونەی زۆر لە قورئاندا هەن بەڵام ئێمە بە سێ نموونە واز دێنین، بەڵام بەر لەوەی ئەو سێ نموونە ئایەتە بخەینە ڕوو، دەڵێیـن:

بێگومان لەكاتێكدا خوای پەنهانزان (عزّو جلّ) ئیمانداران (المؤمنون)و بەندە چاكەكان (عباد الرحمن)و پارێزكاران (المتقون) بەوە پێناسە دەكات كە خاوەنی خووڕەوشتی بەرزو پەسندنو بە خەسڵەتە جوانەكان ڕازاوەن، مانای وایە بە ئەندازەی هاتنەدی ئیمانو بەندایەتیو پارێزكاری (الایمان والعبودیة والتقوی) لە ئینسانی مسوڵماندا خوو خدەو خەسڵەتە بەرزو پەسندەكانیشی تێدا پەیدا دەبن! ئێستاش با ئەو سێ نموونە ئایەتەی گوتمان بخەینە ڕوو:

1) خوای پەروەردگار لە سەرەتای ئایەتی سوڕەتی (المؤمنون) ئایەتەكانی (1 -11)دا فەرموویەتـی: بسم الله الرحمن الرحیم ﴿ قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ ۞ الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ ۞ وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ ۞ وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ ۞ وَالَّذِينَ

**هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ...﴾** ، واتە: ( بەناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، بێگومان بڕواداران سەرفرازن، ئەوانەی کە لە نوێژەکانیاندا بۆ خوا زەبوونو ملکەچن، وە ئەوانەی کە لە قسەو ڕەفتاری پووچو بێسوود واز دێنن، وە ئەوانەی کە زەکات دەدەن، وە ئەوانەی کە داوێنی خۆیان دەپارێزن...) .

2) وە لە ئایەتەکانی کۆتایی سورەتی(الفرقان) ئایەتەکانی (63 – 76)دا فەرموویەتی: **﴿وَعِبَادُ الرَّحْمَنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْناً وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَاماً ...﴾** ، واتە: وە بەندەکانی خوای بە بەزەیی ئەوانەن کە بە ئارامیی بەسەر زەویدا دەڕۆن، وە کاتێك خەڵکی نەفام قسەیان لەگەڵدا دەکەنو بە شێوەیەکی ناشایست لەگەڵیاندا ڕوو بەڕوو دەبنەوە – ئەوان قسەی سەلامەتیان لەگەڵدا دەکەن- یاخود سەلامیان لێ دەکەن .

3) وە لە دوو ئایەتی (133و134)ی سورەتی (آل عمران)دا فەرموویەتی: **﴿وَسَارِعُواْ إِلَى مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ۞ الَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي السَّرَّاء وَالضَّرَّاء وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾**، واتە: وە خێرایی بکەن بەرەو لێبوردنێك لە پەروەردگارتانەوە، وە بەرەو بەهەشتێك کە فراوانییەکەی هێندەی فراوانی ئاسمانو زەوییە، ئامادەکراوە بۆ پارێزکاران، ئەوانەی کە ماڵی خۆیان دەبەخشن لە کاتی تەنگ دەستییو لە کاتی دەوڵەمەندیدا، وە ئەوانەی کە ڕقو تووڕەیی خۆیان قوت

دەدەنەوە، وە چاوپۆشی لە خەڵك دە کەن، وە خوا چاکەکارانی خۆش دەوێ. کەواتە ئیماندار کەسێکە ڕەوشتی بەرزو جوان بێ وەبەندە خواپەرستو ڕاستەقینەکانی خوا ڕەو شتیان جوا نە، وە پارێزکاران کەسانێکن ڕەوشتو ئاکاریان بەرزو پەسندە.

## دووەم: خووڕەوشتی بەرزو جوان بەڵگەی پێغەمبەرا یەتی (محـــمــد)ە ﷺ :

خوای پەروەردگار ڕەوشتی بەرزو جوانی (محمد المصطفی)ی ﷺ کردۆتە بەڵگەی ئەوە کە پێغەمبەری خوا یە، وەك لە سەرەتای سورەتی (القلم)دا دەفەرموێ: ﴿بسم الله الرحمن الرحيم ۞ ن وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ ۞ مَا أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ ۞ وَإِنَّ لَكَ لَأَجْراً غَيْرَ مَمْنُونٍ ۞ وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ (القلم 1-4)، واتە سوێند بە قەڵەمو بەوەی کە دەینووسن، تۆ ئەی (محمد) بە هۆی نیعمەتی پەروەردگار تەوە، کە پێغەمبەرایەتییـــە، شێت نی! وە تۆ پاداشـــتێکی نەبڕاوەت هەیە، وە تۆ لەسەر ڕەو شتێکی مەزنی! واتە: مادام ڕەوشتو خووت زۆر بەرزو مەزنە، کەوا تە پێغەمبەری خوای، وەکو مەولەوی شاعیری کورد لەوبـــارەوە دەڵێ:

هـــەتیو وەئـــەدەو ئومـــی عەللامـــە

لـــەمە موعجیزەتر موعجیزە کامە؟!

بەڵێ پێغەمبەری ئێمە ﷺ لە سکی دایکیدا بووە کە بابی مردووە، وە تەمەنی شەش ساڵان بووە دایکی مردووە، وە هەشت ساڵان بووە کە باپیریشی مردووە! بۆیە بەبێ دایك‌و بابی گەورە بووە، کەچی لە لووتکەی هەرەبەرزی ئاکارو ڕەوشتی بەرزی جوان بووە، بۆیە مەولەوی شاعیر دەڵێ: (هەتیو وەئەدەو) یانی( منداڵی بێ دایك‌و باب‌و خاوەن ئەو ڕەوشتە بەرزە بێ (ئومی عەللامە) واتە: نەخوێندەوار بێ‌و عەللامە بێ، وە هەر چی خوێندەوارو زانایە شانازیی بەوەوە بکات کە قوتابی ئەو پێغەمبەرە بێ ﷺ کە نەخوێندەوار بووەو نەیتوانیوە بنوسێ‌و بخوێنێتەوە وەك خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿وَمَا كُنتَ تَتْلُو مِن قَبْلِهِ مِن كِتَابٍ وَلَا تَخُطُّهُ بِيَمِينِكَ إِذاً لَّارْتَابَ الْمُبْطِلُونَ﴾ (العنكبوت  48) ، واتە: وە  ئەی محمــد !- خۆ تۆ لەپێش قورئاندا نە هیچ کتێبێکت خوێندۆتەوەو نە هیچ شتێکت بەدەستی ڕاستت نووسیوە، چونکە ئەگەر وابوایەی ئەهلی باطل دەکەوتنە دوودڵیی یەوە. کەواتە خوێندن‌و نووسین نەزانینیی‌و، زاناو عەللامە بوونی، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوا فێری کردوە، دیسان هەتیوو بێ باب‌و دایك گەورە بوونی‌و لەسەر ڕەوشتی بەرزو مەزن بوونی، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خوای بە بەزەیی ئەوی لەسەر ئەو ئەدەب‌و ڕەوشتە بەرزو جوانە پەروەردە کردوە.

## سێیەم: خووڕەوشتی بەرزو پەسند مایەی خۆشویستراني لای خواو کامڵ بووني ئیمانە.

لەو بارەشەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموودەی زۆرن‌و بەڕاشکاویی دەیخاتە ڕوو کە مسوڵمانی ڕەوشت بەرز، دۆست‌و خۆشەویستی خوایەو ئیمانێکی کامڵی هەیە، بەواتایەکی دی مرۆڤ ڕەوشت‌و ئاکاری بەرزو جوان نابێ هەتا ئیمانێکی باشی نەبێ‌و لای خوا نزیك‌و خۆشویستراوو پەسند نەبێ!.

فەرموودەی یەکەم: ((أَحَبَّ عبادِ الله الى الله أحسنهم خُلُقاً)) (رواه الطبراني وصَحَّحَهُ الألباني)، واتە: خۆشەویستترینی بەندەکان لە لای خوا ئەوانەیانن کە ڕەوشتیان چاکترە، واتە: کێ لە مسوڵمانان خووڕەوشتی بەرزو جوانتر بێت لە لای خوا خۆشەویستترە.

فەرموودەی دووەم: ((أفضل المؤمنين أحسنهم خلقاً))، (رواه ابن ماجه والحاكم وصَحَّحَهُ الألباني)، واتە: چاکترین ئیمانداران ئەوانەن کە ڕەوشتیان چاکترو جوانترە .

فەرموودەی سێیەم: ((أكمل المؤمنين ايماناأحسنهم خلقاً)) (رواه أحمد وأبو داود وأبن حبان والحاكم وصَحَّحَهُ الألباني)، واتە: ئیمان تەواوترینی ئیمانداران ڕەوشت جوانترینیانن، واتە: ئینسان هەتا ئیمانی تەواوترو دامەزراوتر بێت، ڕەوشت‌و ئاکاری بەرزترو چاکتر دەبێ.

فەرمـوودەی چوارەم: ((خيارکم أحاسنکم أخلاقاً)) (رواه البخاري ومـ سلم وأحمد)، واتـه: چاکترینی ئێوە- ئەی مسوڵمانان - ئەوانەتانن کە ڕەوشتیان جوانترە، کەواتە ئینسان بەهۆی خوورەو شتی بەرزو جوانەوە، لە تەرازووی خواو پێغەمبەرەکەیدا ﷺ چاك دەبێت!.

فەرمـوودەی پێنجەم: ((ان من أحبکم الـيَّ وأقربکم مني مجلساً يوم القيامـة أحاسنکم أخلاقاً)) (رواه الترمذي وحَسَّنه الألباني)، واتـه: ئەوانەتان کە لە هەمـوو کەس لەلام خۆشەویستتـرن وە لەڕۆژی دواییدا کۆڕو مەجلیستان لە هەمووتان لێم نیزیکترە، ئەوانەتانن کە خووڕەوشتیان بەرزو چاکترە.

## چوارەم: خووڕەوشتی چاك‌و پەسند مایەی قورس بوونی تەرازووی چاکەکان‌و چوونە بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوەیە.

بەڵێ بەڕێزان!

لایەنێکی دیکەی گرنگی‌و بایەخی ڕەوشت بەرزو جوان ئەوەیە کە لە تەرازووی خێرو چاکەدا یەکجار قورس‌و گرانەو سەرەکیترین هۆکاری پارێزران لە دۆزەخ‌و چوونە بەهەشتەو لەوبارەشەوە ئەم چەند فەرموودەیە بە نموونە دێنینەوە:

1/ ((ما من شيءٍ أثقل في ميزان المؤمن يوم القيامة من خُلُقٍ حسنٍ) (رواه المسلم وصَحَّحَهُ الألباني)، واتـه: هیچ شتێك لە ڕۆژی

دواییدا لە تەرازووی ئیمانداردا قورستر نیە لە ڕەو شتی بەرزو جوان.

2/ هەروەها لە فەرمایشتێکی دیکەدا کە  ابوداود و ابن ما جە- هێناویانە، وە -ألباني- یش بە ڕا ست - صحیح-ی دا ناوە، دەفەرموێ: ((ان المؤمن ليدرك بحسن خلقهِ درجة القائم الصائم)) واتە: بێگومان ئیماندار بەهۆی ڕەوشتی جوانییەوە دەگاتە پلەی کەسێك کە هەموو ڕۆژێك بەرۆژوویە وە شەوانەش بە در ێژایی شەو شەونوێژان دەکات .

3/ دیسان پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکی دی کەدا دە فەرموێ: ((من كان سَهْلاً هَيِّنا لَيِّناً حَرَّمَهُ الله ع لى ال نار)) (رواه الحاكم والبيهقي وصَحَّحَهُ الالباني) ، واتە: هەرکەسێك ئاسان بێو ئارام بێو نەرم بێ، خوا لە ئاگر قەدەغەی دەکا، یانی لە هەڵ سوکەوتی لەگەڵ خەڵکیدا ئاسان بێو بەگرێو گۆڵو ئاڵۆز نەبێ وە ئارامو پشو درێژ بێت، پاشان نەرم ب ێتو ڕەقو ز بر نەبێت.... جا بێگومان کەسێك دەتوانێ بەو شێوەیە بێ کە ئیماندار بێ، بۆیە دەبێ ئاگادار بینو بە هەڵە لەو فەرمای شتە حاڵی نەبین، کەسێکی بێ ئی مانو بێ تەقوا، ب ڵێ: من هەموو ئەو خەسڵەتانەم تێدان کەواتە بە ئاگری دۆزەخ نا سووتێم!! بە تەئکید ئەوە حاڵی بوونێکی زۆر هەڵەیە، چونکە بە بێئیمان بە هیچ شێوەیەك مرۆڤ ناتوانێت وەك پێویست خاوەنی ڕەو شتی بەرز بێت  وەك لە دواییدا باسی دەکەین - .

4/ دیـ سان ـلە فەرمایشـ ـتێکی د ـیدا کە تر مذي- هێناویەتـــی و بە- صحیح- یشی داناوە، دەفەرمویٚ: (سئل عن أكثر ما يُدْخِلُ الجَنَّةَ؟ قال تـقوى الله وَحُسْنُ الخُـلُـق)، وا ـتە: پرسیار لە پێغەمبەر ﷺ کرا ئەی پێغەمبەری خوا- چ شتێك لە هەموو شتێك زیاتر خەڵك دەخاتە نێو بەهەشت؟! فەرمووی: (پارێزکاریی لە خواو ڕەوشتی جوان).

ئەوە کورتەیەك بوو دەربارەی گرنگیو پـلەو پا ـیەی ڕەو شتی - بەرزو چاك- ئێستاش نۆرەی ئەوەیە کە لە چاوگو سەرچاوەی ڕەوشتی بەرزو پەسند بکۆڵینەوە کە ئیمانەو چۆنیەتی پەیوەندی نێوانیانە.

بۆ ئەوەی پەیوەندی نێوان ئیمانو خووڕەوشتی بەرزو جوانمان لەلا ڕوونو درەوشاوەبێو بزانین گاریگەری ئیمانو عەقیدە چۆنو چەندە بۆ سەر خووڕەوشتو ئاکاری پەسند، با سەرنجی هەردوو ئایەتی ژمارە (24و25) لە سورەتی(ابراهيم) بدەین:

خوای بەرزو بێوێنە (عزّو جلّ) پێغەمبەری کۆتایی خۆی دەدوێنێو دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي السَّمَاء ۞ تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ بِإِذْنِ رَبِّهَا وَيَضْرِبُ اللَّهُ الأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾، واتە: ئایا (ئەی- محمد- یان هەر کەسێکی دی کە قورئان دەخوێنێ) سەرنج نادەی چۆن خوا وێنەی بۆ وشەیەکی پاكو چاك بە درەختێکی پاكو چاك هێناوەتەوە! کە ڕەگو ڕیشەکەی چەسپاوە لە زەویداو لقو پۆپەکەی بەرەو سەرێ هەڵچووە، هەردەم بە مۆڵەتی پەروەردگاری میوە دەبەخشێ! وە خوا وێنان بۆ خەڵکی دێنێتەوە بەڵکو پەند وەربگرنو بەهرەمەند بن.

شایانی باسە کە سەرجەم توێژەرەوان(مفسرين)ی قورئان لە سەر ئەوە یەکدەنگن کە مەبەست لە (كلمة طيبة) وتەی بەرزو پیرۆزی (لا اله الا الله)یە کە دیارە (محمد رسول الله)ش تەواوکەریەتی، چونکە بێگومان بە هۆی (محمد)ەوە ﷺ نەبێ، ناگونجێ (لا اله الا الله) جێبەجێ بکرێو کاری پێ بکرێ.

جا خوای بێوێنەو هاوتا (سبحانه و تعالی) لێرەدا وشەی بەرزو بە بەرەکەتی شایەتمانی شوبهاندوە بەدرەختێکی بەردار (شـجرة مثمرة)ەوە کە لە سێ بەشی سەرەکی پێکهاتوە:

1- ڕەگ و ڕیشە.

2- قەدو لـق و پۆپ.

3- بەرو میوە .

جا هەرچی ڕەگو ڕیشەیە ئەوە بە ناخی زەویدا چۆتە خوارێو تێیدا چەسپیوە، قـەدو لقو پۆپەکەش بەرەو ئا سمانی بەرزبۆتەوەو هەڵکشیوە، میوەو بەرەکەیشی هەمیشەیی و چوار فەسڵەیە.

ئنجا ئیمانو عەقیدەی ئینسانی مسوڵمانیش بە هەمان شێوەیەو بنكو ڕیشەو ئەسڵەکەی لە عەقڵو دڵدا جێگیرو چەسپاوەو، ڕواڵەتو ئەندامەکانیشی پابەندن بە شەریعەتی خواوەو سەرگەرمی طاعەتو فەرمانبەرینو، هەمیشەش ڕازاوەیە بە خووو خدەی بەرزو ڕەو شتو ئاکاری جوانو دڵگیـر.

ئنجا وەك چۆن بەبێ ڕەگو ڕیشەو بنك قەدو لقو پۆپو گەڵای درەختەکە ناگونجێ هەبن، بە هەمان شێوەش بەبێ ئیمانو عەقیدەی بە عەقڵو فام کراوو لە دڵدا چەسپاو، طاعەتو پابەندی بە شەریعەتەوە پەیدا نابێو، بەبێ هەرکام لە ئیمانو طاعەتیش، خووڕەوشتی بەرزو پەسند لە مرۆڤـدا پەیدا نابێ، وەك چۆن میوەو بەری درەخت بەبێ ڕەگو ڕیشەو قەدو لق و پۆپ پەیدابوونی مەحاڵە.

کەواتە: لە نێوان خووڕەوشتی بەرزو پەسندو ئیماندا پەیوەندییەکی مەحکەم‌و ڕاستەوخۆ هەیەو هەربۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ ڕایگەیاندوە کە ئیمان تەواوترینی مسوڵمانان ڕەوشت جوانترینیانن: ((أكمل المؤمنين إيمانا أحسنهم خُلُقا)) (رواه أحمد وأبوداود وابن حبان والحاكم وصَحَّحَهُ الألباني)، واتە: ئیمان‌و عەقیدەی ڕاست‌و ساغ‌و تەواو خووڕەوشتی بەرزو پەسند لە ئینساندا پەیدا دەکات! دیارە ئەم ڕاستییەش ڕاستییەکی دیکەی گرنگی لێ دەستگیر دەبێ ئەویش ئەوەیە کە:

ئاکاری جوان‌و شیرین‌و ڕەوشتی چاك ئاوێنەیەکە کە ئینسانی مسوڵمان ڕاددەی ئیمان‌و تەقواو مسوڵمانەتی خۆی تێدا دەبینێ‌و، پێوەرو تەرازوویەکە خۆی پێ دەناسێ‌و هەڵدەسەنگێنێ، هەربۆیەش ئێمە ناوونیشانی ئەوکۆڕەمان بەم جۆرە داناوە:

(خووڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتییە).

بەرێـــزان:

خوا پشتیوان بێ لەم تەوەرەی چوارەمدا هەوڵدەدەین لە حەوت خاڵاندا بەرهەمە گرنگ‌و سەرەکییەکانی خووڕەوشتی بەرزو جوان بەکورتی‌و پوختی بخەینەڕوو:

## یەکـەم:- شایستەبوونی حیساب کران لە ئوممەتی (محمد)دا کە چاکترین ئوممەتە:

خوای بەرزو مەزن تبارك وتعالی ڕایگەیاندوە کە ئوممەتی ئیسلام بە ڕابەرایەتی (محمد المصطفی) ﷺ چاکترین کۆمەڵە کە بۆ مرۆڤایەتی هێنراوەتەدی ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوە کە خاوەنی ئیمان‌و پاکسازیی‌و چاکسازیین، وەك فەرموویەتی: ﴿كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ...﴾ (آل عمران- 110)، واتە: ئێوە باشترین کۆمەڵن کە بۆ خەڵکی پەیداکراون فەرمان بە هەموو چاکەیەك دەکەن‌و ڕێ لە هەموو خراپەیەك دەگرن‌و ئیمان بە خوا دێنن...

کەواتە: کەسانێك کە هەڵدەستن بە پاکسازیی‌و بژارکردنی خەڵك‌و کۆمەڵگایان‌و چاکسازیی تێداکردن‌و ڕازاندنەوەی بە هەرچی چاکەیە، ئەوە دەچنە ڕیزی کۆمەڵی هەڵبژاردەی پێغەمبەری خواوە ﷺ .

ئاشكراشە كە ئینسان هەتا خۆی پاكسازییو چاكسازیی نەكات چاكسازییو پاكسازیی خەڵكی پێناكرێ، كەواتە: تەنیا خۆ پاكو چاككەرانو ڕەوشتو ئاكار بەرزو پەسندانی ئیماندار شایستەی ئەوەن كە لە ڕیزی كۆمەڵی هەڵبژاردەی پێغەمبەردا ﷺ حیساب بكرێن.

## دووەم: وەدەستهێنانی ئامانجی پێغەمبەر ﷺ

پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاندوە كە تەنیا بۆ تەواوكردنی ڕەو شتی بەرزو جوان ڕەوانەكراوە، وەك دەفەرموێ: ((انما بعثت لأُتمم صالح الاخلاق)) (رواه ابن سعد والبخاري في الادب المفرد والحاكم والبيهقي و صَحَّحَهُ الألباني)، واتە: من تەنیا بۆ ئەوە ڕەوانەكراوم كە ڕەوشتی بەرزو جوان تەواو بكەم، واتە: - هەرچی ڕەوشتو ئاكاری جوانە لە خۆمدا بەرجەستەی بكەم بۆ ئەوەی ببمە سەرمەشق بۆ خەڵك.

كەواتە: ئەگەر دەمانەوێ ڕەوشتی بەرزو جوان بەبەرجەستەكراویی ببینین، با تەماشای (محمد)ﷺ بكەین، هەروەها كاتێك ئێمە ڕەوشتمان بەرزو جوان دەبێ، مانای وایە ئەو مەبەستو ئامانجەمان هێناوەتەدی، كە پێغەمبەری خوای ﷺ بۆ ڕەوانە كراوە.

## سێیەم: هەمیشە لە خواپەرستیدا بوون:

بەڵێ بەڕێزان!

ئینسان بەهۆی ڕەوشتی بەرزو جوانەوە هەمیشە لە عیبادەتدا دەبێ، وەك ئەوەی کە هەمیشە سەری لە سوجدە دابێ وایە! بۆ چی؟! چونکە پێغەمبەر ﷺ دە فەرموێ: ((ان الرجل لَيُدْرِكُ بِحُسْنِ خُلُقِهِ درجة قائم الليل و صائم النهار)) (رواه أحمد والحاكم و صَحَّحَهُ الألباني)، واتە: ئینسانی مسوڵمان بەهۆی ڕەوشتی بەرزو جوانی دەگاتە پلەکانی کەسێك کە هەمیشە ڕۆژ بەڕۆژوویەو شەو لە خوا پەرستیدایە .

کەواتە: مرۆڤ بەهۆی ڕەوشتی بەرزو ئاکاری پەسندی یەوە وەك ئەوە وایە کە هەمیشە لە طاعەتدا بێ.

## چوارەم: خۆشویستران لە لایەن خواوە:

خوای پەروەردگار لە قورئاندا ڕایگەیاندوە کە خاوەنی ڕەوشتو خووە بەرزو جوانەکانی خۆش دەوێن، بۆ وێنە: لە ئایەتی ژمارە(222)ی سوورەتی (البقرة)دا دە فەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ﴾، واتە: بێگومان خوا ئەوانەی خۆش دەوێ کە بە بەردەوامی دەگەڕێنەوە لای خواو تەوبە دەکەن، وە ئەوانە شی

خۆش دەوێن کە بە بەردەوامی خۆیان لە پیسی ڕواڵەتو پەنهان پاك دەکەنەوە.

1- دیسان لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (146)دا دە فەرمویَ: (**والله يحب الصابرين**)، واتە: وە خوا خۆڕاگرانی خۆش دەویَ.

2- هەر لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی(148) دەفەرمویَ: (**والله يحب المحسنين**)، واتە: وە خوا چاکە کارانی خۆش دەویَ، چاکەکاریش ئەو کەسەیە کە یارمەتی خەڵك دەداتو دەست باریان بۆ دەگریَو قسەی چاکیان بۆ دەکاتو سوودێکیان پیَدەگەیەنیَ، جا بیَگومان کە سێکیش وا بیَ خوای داد گەر خۆشی دەویَ.

3- وە لە هەمان سوورەتو لە ئایەتی(158)دا دەفەرمویَ: (**إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ**)، واتە: وە بیَگومان خوا ئەوانەی خۆش دەویَ کە پشتیان بە خوا قایمەو پشت بە خوا دەبەستن.

4- ئینجا بیَگومان پیَغەمبەری سەروەرمان (**محمد**) ﷺ خاوەنی بەرزترینو جوانترینو باشترین خووڕەوشت بووەو خوای کاربەجیَش لەسەری پیَویست کردووین کە شویَنی بکەوینو لە هەموو شتیَکدا بیکەینە سەر مەشقو چاوساغمان بە تایبەت لە بواری خووڕەوشتی مەزنو ناوازەیدا، وە پیَشی ڕاگەیاندووین کە شویَن پیَهەڵگرتنمان بۆی مایەی خۆشویستــرانمانە لە لایەن خوای بیَویَنەوەو بەڵگەی خۆشەویستیشمانە بۆ خوا: (**قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللّهُ...**) (آل عمران-3).

کەواتە: بە هۆی شوێنکەوتنی پێغەمبەری خواوە ﷺ ڕەوشتمان بەرزو جوان دەبێو لە ئاکامی ئەوەشدا دەبینە خۆشەویستی خواو خۆشەویستی خۆشەویستی خواش!.

## پێنجەم: دووربوون لە سیفەتە نزمو پەستەکانی کافرو دەغەڵ (منافق) و هاوبەشدانەران (المشركين):

بەڵێ خوشك و برایانی سەنگین و شیرین!

بەرهەمێکی دیکەی گەورەی خووڕەوشتی پەسندو چاك ئەوەیە کە خاوەنەکەی پارێزراو دەبێ لەوە کە گیرۆدەی داوی سیفەتو ڕەفتارە دزێو پەستەکانی بێبڕواو دەغەڵو هاوبەش بۆ خوا دانەران ببێ!
چونکە: وەك چۆن ئیمانو خوا بەیەکگرتن (الإيمان والتوحيد) سەرچاوەی سەرجەم خەسڵەتو ڕەوشتە بەرزو جوانەکانن و خاوەنەکانیان بە هەموو شتێکی جوانو چاك دەڕازێننەوە، بە پێچەوانەوەش زەلکاوی بێبڕوایی و دەغەڵیی و هاوبەشدانان (الكفر والنفاق والشرك)یش گەراو ماك و میکرۆبی تێکڕای خووخدەو ڕەفتارە پیس و نزمەکانی تێدا دەترووکێ!
بۆیە هەمیشە ئیمانداران و خواپەرستانی ڕاستەقینە، سیفەتو ئاکارو هەڵس و کەوتەکانیان دژو پێچەوانەی هی کافرو دەغەڵو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانن و، کاتێك بابای مسوڵمان بەڕاستی خۆی دەڕازێنێتەوە بە ئاکارو ڕەوشتە بەرزو پەسندەکانی وەك: ڕاستی، دادگەری، بەزەیی، وەفا، بەخشندەیی، ئازایەتی، ئینصاف،

چاکەکاری، خۆبەکەمگریی، دڵسۆزیی، دەستپاکی، ڕووگەشی، زمان شیرینی، نەرم ونیانی، لێبوردەیی، سینە سافی... هتد. سەلامەتو پارێزراو دەبێ لەو خەسڵەتو ڕەفتارە پیسو پە ستانەی کە کافرو مونافیقو موشریکەکانیان پێ پێناسە کراون لە قورئانی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەیدا ﷺ، بۆ نموونە:

یەکەم: دەربارەی کافران:

أ/ ﴿ وَوَيْلٌ لِّلْكَافِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ۞ الَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا عَلَى الآخِرَةِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللّهِ وَيَبْغُونَهَا عِوَجاً أُوْلَـئِكَ فِي ضَلاَلٍ بَعِيدٍ﴾ (ابراهیم-2،3) . وەك دەبینین لێرەدا خوای زاناو توانا کافرەکانی بەسێ سیفەت پێناسە کردوون:

1- هەڵبژاردنی دنیا بەسەر دواڕۆژدا ﴿الَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا عَلَى الآخِرَةِ﴾.
2- خەڵك لادان لە ڕێی خوا ﴿وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ اللّهِ﴾.
3- شێواندنی ڕێبازی خواو خوارو خێچ خستنە بەرچاوی ﴿ يَبْغُونَهَا عِوَجاً ﴾.

ب/ هەروەها خوای زاناو توانا فەرموویەتی: ﴿ فَلَا تُطِعِ الْمُكَذِّبِينَ ۞ وَدُّوا لَوْ تُدْهِنُ فَيُدْهِنُونَ ۞ وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ۞ هَمَّازٍ مَّشَّاءٍ بِنَمِيمٍ ۞ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ۞ عُتُلٍّ بَعْدَ ذَلِكَ زَنِيمٍ﴾(القلم 8- 13).

لێرەشدا خوای پەنهانزان یەکێك لە کافرەکانی ناحەزی

پێغەمبەری خوای ﷺ بە یازدە (11) سیفەتی خراپ پێنا سە کردوە:

1) بەدرۆ زانینی پێغەمبەری خوا ﷺ (الْمُكَذِّبِينَ) .
2) موداهەنەکردن (فَيُدْهِنُونَ) .
3) زۆر سوێند خواردن (حَلَّافٍ) .
4) ڕیسوایی سوکیی (مَّهِينٍ) .
5) غەیبەتکردن (هَمَّازٍ) .
6) قسە هێنان و بردن (مَّشَّاء بِنَمِيمٍ) .
7) بوونە پەرچ لە ڕێی خێرو چاکەدا (مَنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ)
8) سنوور بەزێن (مُعْتَدٍ) .
9) تاوانباریی (أَثِيمٍ) .
10) ملهوڕیی (عُتُلٍّ) .
11) ڕەچەڵەك نەزانراویی (زَنِيمٍ) .

ج/ پێغەمبەری بە ڕەوشت بەرزیشمان ﷺ دەربارەی زۆر خۆریی بابای کافر لەچاو کەمخۆریی ئینسانی مسوڵمان فەرموو یەتی: ((المؤمن يأكل في معي واحد والكافر يأكل في سبعة أمعاء)) (رواه البخاري عن ابن عمر رضي الله عنهما)، واتە: بڕوادار لە ڕیخۆڵەیەکدا دەخوات بەڵام کافر لە حەوت ڕیخۆڵەدا.

گومانیشی تێدا نیە کە بەهێز بوونی لایەنی مەعنەوی مرۆ ڤ بەهۆی ئیمان و عیبادەت و پارێز کارییەوە کار دەکاتە سەر جەستەی و لە بەرامبەر برسێتی و سەرماو گەرماو سەختیەکاندا وزەی زیاتری پێدەبەخشێ.

دووەم: دەربارەی دەغەڵان (المنافقون):

أ/ ﴿ إذا جاءكَ الْمُنَافِقُونَ قَالُوا نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ اللَّهِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ ۞ اتَّخَذُوا أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً فَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ إِنَّهُمْ سَاءَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ۞ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ آمَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا فَطُبِعَ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ۞ وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ وَإِن يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ كَأَنَّهُمْ خُشُبٌ مُّسَنَّدَةٌ يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ هُمُ الْعَدُوُّ فَاحْذَرْهُمْ قَاتَلَهُمُ اللَّهُ أَنَّى يُؤْفَكُونَ ۞ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ لَوَّوْا رُؤُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ ۞ سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ ۞ هُمُ الَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُوا عَلَى مَنْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّى يَنفَضُّوا وَلِلَّهِ خَزَائِنُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لا يَفْقَهُونَ ۞ يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ (المنافقون 1-8) .

لێرەدا خوای پەروەردگار دەغەڵەكانی بە دوازدە(12) لە سیفەتو ئاكارە خراپەكانیان پێناسە كردوە:

1) درۆزنیی ﴿.. إِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَكَاذِبُونَ﴾ .

2) سوێند بەدرۆ خواردن ﴿ اتَّخَذُوا أَيْمَانَهُمْ جُنَّةً ﴾.

3) خەڵك لەرِێی خوا لادان ﴿فَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّه ﴾.

4) كردەوەی خراپ ئەنجام دان ﴿ إِنَّهُمْ سَاءَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾.

5) كوفر كردن پاش ئیمان ﴿آمَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا..﴾.

6) تێنەگەیشتن ﴿ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴾.
7) ڕواڵەتی جوانو نەیەوەرۆکی وێران ﴿وَإِذَا رَأَيْتَهُمْ تُعْجِبُكَ أَجْسَامُهُمْ﴾.
8) قسەی شیرینو بۆش ﴿وَإِن يَقُولُوا تَسْمَعْ لِقَوْلِهِمْ﴾.
9) هەمیشە لەخۆ دڕدۆنگ بوون ﴿يَحْسَبُونَ كُلَّ صَيْحَةٍ عَلَيْهِمْ﴾.
10) خۆ بەزلگریی ﴿وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ﴾.
11) لە ڕێ دەرچوونو لەخوا یاخی بوون ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾.
12) نەزانیی ﴿وَلَكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾.

ب/ پێغەمبەری خواش ﷺ لەبارەی دەغەڵو دووڕووەکانو سیفەتو ڕەفتارە خراپو بەدەکانیان فەرمایشتی زۆرن کە ئەمە یەکێکیانە: ((أربع من كن فيه كان منافقاً خالصاً ومن كانت فيه خصلة منهن كانت فيه خصلة من النفاق حتى يدعها: أذا أؤتمن خان، وأذا حدث كذب، وأذا عاهد غدر، وأذا خاصم فجر)) (رَواهْ البُخاري وَمُسْلم عن عبدالله بن عمرو بن العاص)، واتە: چوار سیفەت هەرکەسێك تێیدابن ئەوە مونافیقێکی تەواوە وەهەرکەسێك یەکێکیانی تێدابێ ئەوە سیفەتێکی نیفاقی تێدایە مەگەر وازی لێ بێنێ:

- هەرکات سپاردەی پێ سپێردرا خیانەتی پێ بکات .
- وە ئەگەر قسەی کرد درۆ بکات .
- وە ئەگەر پەیمانیدا بیشکێنێ .
- وە ئەگەر دەمەقاڵی یەکی بوو سنوور ببەزێنێو خۆی

تووشی تاوان بکات .

سێیەم: دەربارەی هاوبەش بۆ خوا دانەران:

أ/ ﴿ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ۞ مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَ كَانُوا شِيَعاً كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴾ (الروم 32،31) .
ب/ ﴿ قُلْ هَـذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَاْ وَ مَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللّهِ وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ (يوسف 108) .

لەم ئایەتانەشدا چوار سیفەتی سەرەکی هاوبەش بۆ خوا دانەران خراونەتە ڕوو:

1) بەش بەشکردنی ئایین ﴿فَرَّقُوا دِينَهُمْ﴾ .
2) پەرتەوازەیی‌و تاقم تاقم بوون ﴿وَكَانُوا شِيَعاً﴾.
3) هەر کەسە تەنها خۆ پێڕاست بوون ﴿كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ﴾.
4) بەبێ بەرچاو ڕەوونییو شارەزایی کەوتنە شوێن ڕێچکەو بیردۆزەکان ﴿ قل هذه سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ... وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾.

کەواتە: لە سۆنگەی ڕەوشتو ئاکاری بەرزە پەسندو شەرعییانەوە ئینسانی مسوڵمان لە سەرجەم ئەو خەسڵەتو هەڵسوکەوتو ڕەفتارە ناشیرینانە سەلامەتو پارێزراو دەبێ، کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ پێنا سەی ئەهلی کوفرو نیفاقو شیرکیان پێ کردوونو دژو پێچەوانەشن لەگەڵ ئیمانو خوا بەیەکگرتنو مسوڵمانەتییدا.

## شەشەم: تۆکمەیی و توندوتۆڵی کۆمەڵ و کۆمەڵگا.

بەرهەمێکی دیکەی ڕەوشتی بەرزو جوان بریتییە لە تۆکمەیی و توندو تۆڵیی مسوڵمانان، چونکە مسوڵمانان ئەگەر خاوەنی ڕەوشتی بەرزو جوان بن و ڕەوشت و ئاکارە بەرزو جوانەکانی ئیسلام لە خۆیاندا بەرجەستە بکەن، هەمیشە پەیوەندیی یان توندو تۆڵ دەبێ وە پێکەوە جۆشدراو دەبن، با سەرنج بدەین دا خۆ پێغەمبەر ﷺ لەو فەرمایشتەیدا چۆن کۆمەڵگای ئیسلامییمان بۆ وێنا دەکات! دەفەرموێ: ((مثل المؤمنين في توادهم و تراحمهم وتعاطفهم مثل الجسد اذا اشتكى منه عضو تداعى له سائر الجسد بالسهر والحمّى)) (رواه أحمد والبخاري ومسلم)، واتە: وێنەی ئیمانداران لە یەکدی خۆشویستنیان و بەزەیی بەیەکتردا هاتنەوەیان و سۆزو پەرۆشیان بۆ یەکتر، وەکو جەستەیەك وایە کاتێك ئەندامێکی نەخۆش دەکەوێ هەموو ئەندامەکانی دیکەی لەگەڵی دەکەون لە شەونخوونی و ئیسراحەتیان لێ تێکدەچێ و تایان دێتێ. واتە: مسوڵمانانیش دەبێ ئاوابن.

ئنجا بەڕاستی مسوڵمانن! دیارە مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو وێچواندن (تشبيه)ەدا ئەوەیە، ئایا لە جەستەی ئینسانێکدا، دەست لەگەڵ چاو هیچ کێشەی هەیە؟! هەروەها بە هەمان شێوە ئەندامەکانی دیکە، ئایا دژی یەکن و پێکەوە ناکۆکن؟! نەخێر، بەڵکو هەموویان تەواوکەری یەکترن و وێکڕا کۆکن، کەواتە پێویستە

مسوڵمانانیش هەموویان هاوکاری یەکتر بن، ئەوەی دەوری سەر دەبینێ، ئەوەی دەوری چاوو گوێ دەبینێ، ئەوانەیان کە دەوری دەست و بازوو پێ دەبینن، پێویستە هەموویان تەواوکەری یەکتر بن ئەوکاتە مانای وایە مسوڵمانی تەواون، ئاشکراشە کە تەنها کاتێك بەو شێوەیە دەبین کە پێغەمبەرمان ﷺ لێی داوا کردووین، کە ڕەوشتە بەرزو جوانەکان لە خۆماندا بەرجەستە بکەین و خۆمانیان پێ برازێنینەوە.

## حەوتەم: پارێزران لە عەیبداریی دنیاو گوناهباریی ڕۆژی دوایی:

کۆتا بەرهەمی ڕەوشتە بەرزیش بریتییە لە دووریی لە عەیبداریی و گوناهباریی چونکە: ئینسانی مسوڵمان ئەگەر ڕەوشتی بەرزو جوان بێ و ئەخلاقی وەك ئەخلاقی پێغەمبەر ﷺ بێ، ئەوە بەڕاستی لە عەیبداریی دنیاو گوناهباریی قیامەت بەدوور دەبێ، بۆچی؟ ئایا کێ لە دونیادا تووشی عەیبداریی دەبێ؟! دیارە کەسێك کە لەگەڵ خەڵکیدا درۆ دەکات، یان چاو دەبڕێتە ناموسی خەڵکی، یاخود پەیمان دەشکێنێ یان وەفا بە بەڵێنی خۆی ناکات، یان ئەهلی غەدرو زوڵمە، یاخود ڕێز لە خەڵك ناگرێ، یان شەرم و شکۆی کەمە... هتد. هەمیشە ئەوجۆرە کەسانە لە دونیادا عەیبەیان دێتەوەسەری و عەیبدار دەبن.

ئنجا ئایا کێ گوناهبارە؟! دیارە بە زۆری کەسێك کە لە دونیادا هەقی خەڵکی دێتە سەرێ، وەك لە فەرمایشتێکدا کە (بخاري و مسلم) هێناویانە پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵە بەڕێزەکانی دەفەرموێ: ((أتدرون من االمفلس؟!))، واتە: (ئایا دەزانن مایە پووت -مفلس- کێیە؟!) ئەوانیش دەڵێن: لای ئێمە مایە پووت کەسێکە کە زێڕو[1] زیوی نەبێ، دەفەرموێ: نەخێر! بەڵکو لە نێو ئوممەتی مندا مایەپووت کەسێکە، ڕۆژی قیامەتی دێ نوێژو ڕۆژو زەکاتو حەجو خێرو چاکەی پێیە، بەڵام غەیبەتی ئەوی کردوە ماڵی ئەوی خواردوەو دڵی ئەوی ئێشاندوەو، ئەوی نارەحەت کردوە... ، ئنجا لە سزاو تۆڵەو بۆ قەرەبووکردنەوەی هەقی خاوەن هەقەکان لە طاعەتو خێرو چاکەکانی دەدرێ بە خاوەن هەقەکان، هەتا هیچی بۆ نامێنێتەوەو مایە پووچ دێتە دەرێ! دوایی، لەبەر ئەوەی هەقی خەڵکی لە سەر ماوەو چاکەشی نەماوە بدرێ بە خەڵك، بۆیە لە خراپەی ئەو خاوەن هەقانەی بەسەردا دەدرێو بە گوناحەوە فڕێ دەدرێتەوە نێو دۆزەخ!!.

کەواتە: ئینسان بە هۆی ڕەوشتی بەرزو جوانەوە هەم لە دنیادا لە عەیبداریی دەپارێزرێو هەم لە دوارۆژیشدا لە گوناهباریی‌و ڕەنج بە خەساریی.

ئێستاش بۆ ئەوەی بەرە کەتو بەر هەمی ڕەو شت بەرزیی‌و چاکەکارییمان زیاتر بۆ دەربکەوێ لە دنیاو دوارۆژدا، با سەرنجی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەین: ((مَن نَفَّس عن مؤمنٍ

(1) واتە: پارەو سامان، چونکە دراو(عملة)ی ئەوکاتە دینارو درهەم بووە دیارە (دینار) زێڕ بووە (درهم)یش زیو بووە.

كربة من كُرَبِ الدنيا نَفَّس الله عنه كُربةً من كرب يوم القيامة ومن يسَّر على مُعَسِرٍ يسَّر الله عليه في الدنيا والآخرة ومن سَتَرَ مسلماً ستره الله في الدنيا والآخرة والله في عون العبد مادام العبد في عون أخيه)) (رواه أحمد ومسلم وأبوداود والترمذي)، واتە: هەرکەسێك خەمێك لە مسوڵمانێك بڕەوێنێ خوا خەمێکی لێ دەڕەوێنێت لە خەمەکانی ڕۆژی دوایی، وە هەرکەسێك کار ئاسانی بۆ کەسێك بکات کە تووشی گرفتێك بووبێ، ئەوە خوا لەدنیاو دوارۆژدا کاری بۆ ئاسان دەکات، وە هەر کەسێك عەیبی مسوڵمانێك داپۆشێ، ئەوە

پێش هەمووشتێك پێویستە ئەو ڕاستییە بزانین کە: دەکرێ مرۆڤ خووڕەوشتی بەرزو پەسند بەدەست بێنێ، وەك چۆن بە پێچەوانەشەوە لە بارانیدا هەیەو دەتوانێ کە ڕەوشتو ڕەفتاری خراپ وەدەست بێنێ، دیارە بەڵگەش بۆ سەلماندنی ئەو ڕاستییە زۆرن، بەڵام هەر بەکورتی دەڵێین:

خوای پەروەردگار ئەو هەموو پێغەمبەرانەی(علیهم الصلاة والسلام) ناردوون بۆ ئەوەی خەڵکی لە هاوبەش بۆ خوا دانانو کوفرەوە دەرباز بکەن بەرەو خوا بە یەکگرتنو ئیمان، بەواتایەکی دی: خەڵك لە بتپەرستی ڕزگار بکەن بۆ خواپەرستی، وە لە ڕەو شتی خراپو دزێوەوە ڕزگار بکەن بەرەو ڕەوشتی بەرزو پەسندو جوان، لەوبارەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمایشتێکیدا کە (أحمد و طبراني) هێناویانە، دەفەرموێ: (انما العلم بالتَعَلُّم وإنما الحِلْمْ بالتَحَلُّم)، واتە: بێگومان زانیاری بە فێربوونە وە ئارامییو مەندییش بە خۆڕاهێنانە، یانی کەسێك کە زانیاری نەبێ ئەگەر بە دوایدا بگەڕێو هەوڵی بۆ بدا بێگومان زانیاری وەدەست دەکەوێ، بە هەمان شێوەش کەسێك کە خاوەنی سیفەتی هێدییو مەندیی نییە یانی تەنگی پرێسکەیەو زوو تووڕە دەبێو هەڵدەچێ، ئەگەر بێتو خۆی ڕابێنێ فێری هێدییو مەندیی دەبێ، هەروەها لە فەرمایشتێکی دیکەیدا کە (بخاري و مسلم) هێناویانە دەفەرموێ: ((وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفه الله ومَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِه الله ومن يتَصَبَّرْ يُصَبِّرْهُ الله))، واتە: هەر کەسێك خۆی لەسەر قەناعەت ڕابێنێ، خواش

قەناعەتی پێ دەبەخشێ، وە هەر کەسێك خۆی لەسەر بێ نیازیی- چاو لە دەستی خەڵك نەبوون- ڕابێنێ، خوا بێ نیازی دەکات، وە هەر کەسێکیش خۆی لەسەر خۆڕاگریی ڕابێنێ خوا سەبرو خۆڕاگریی پێ دەبەخشێ. جا ئێمە بە چەند ڕێگایەك دەتوانین خووڕەو شتی بەرزو پەسند بەدەست بێنین:

## یەکـەم: قـورئـان کـردنـە هـاودەمو هـاوڕاز:

دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ وەفات دەکات، یەکێك دە چێتە خزمەت (عائیشە) (خوا لێی ڕازی بێ) لێی دەپرسێ: ئەی دایکی بڕواداران! پێم بڵێ پێغەمبەر ﷺ ڕەوشتی چۆن بوو؟! ئەویش پێی دە ڵێ: (( یا بني أولا تقرأ القرآن؟!)) ڕۆڵەگیان قورئانت نەخوێندۆتەوە؟! ئەویش دەڵێ با!! ئەویش دەفەرموێ: (( كان خُلُقه القرآن))، واتە: ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺو هەڵسو کەوتو ئاکاری قورئان بوو[1].

بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانێکی زیندووو بەرجەستە بووە، چونکە هەرچی قورئان فەرموویەتی، بە خووڕەوشتی بەرزو جوانەوە، بە لایەنی کۆمەڵایەتیو سیاسیو حوکمڕانییەوە، بە لایەنی جەنگو جیهادەوە، هەمووی لەخۆیدا بەرجەستە کردوە، بۆیە ئەگەر ئێمە قورئان بکەینە هاوڕازو هاودەمی خۆمانو زۆری بخوێنینو زۆری لێ

(1) رواه مسلم.

ورد بینەوە چاك تێی بگەین، ئەوە بێگومان قورئان تەئسیرمان تێ دەكاتو ئەخلاقمان دەگۆڕێ، بەڵێ هیچ گومانی تێدا نیە ئینسان هەتا لە قورئان نیزیكتــر بێ لە خووڕەوشتی جوان نیزیكتــر دەبێ وە هەتا زیاتر بە قورئاندا بچێتە خوارێ، باشــتــر دەتوانێ دەست لە ئەخـلاقی پەسند گیــر بكات .

## دووەم: پێغـەمبـەری خــوا ﷺ كـردنـە ســەر مـەشــق:

خوای بەخشەر فەرموویەتی: ﴿لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُو اللَّهَ وَالْيَوْمَ الْآخِرَ وَذَكَرَ اللَّهَ كَثِيراً﴾ (الاحزاب -21)، واتە: بێگومان لە پێغەمبەری خوادا ﷺ سەرمەشقییەكی باش هەیە بۆ ئێوە بۆ هەركەسێك بە ئومێدی- ڕەحمەتی- خواو پاداشتی دوارۆژ بێ وە زۆریش یادی خوا بكات.

كەواتە: پێغەمبەری خوا ﷺ سەرمەشقە بۆ هەموو ئینسانێكی مسوڵمان.

ئنجا وەك پێشتر باسمان كرد خوای پەروەردگار پێغەمبەری ﷺ ئێمەی ئاوا وەسف كردوە ﴿وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ یەكێك لە توێژەرەوانی قورئان دەڵــێ: بۆیە خوا نەیفەرمووە (ئەی محمد تۆ ڕەوشــتت بەرزە) بەڵكو فەرموویەتی: (بێگومان تۆ لە سەر ڕەوشتێكی گەورەی) چونكی ڕەوشتی بەرزو جوانی بە وڵاخێــك چواندوە كە پێغەمبەر ﷺ چۆتە سەر پشتی!! ئنجا بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ كردنە سەر مەشقیش بەوە دەبێ چاك تەماشای

ڕەوشتی پێغەمبەری خۆمان بكەین ﷺ بەڕاستی شوێن پێی هەڵبگرینو هەوڵیش بدەین كە خۆمان ڕابێنین لەسەر ئەوەی كە ئەو ﷺ خۆی پێی ڕازاندۆتەوە، ئەوكاتە پێغەمبەرمان كردۆتە سەر مەشقی خۆمان، حەز دەكەم لەوبارەوە وێنەیەكتان بۆ بێنمەوە، ئەنەسی كوڕی مالیك خوا (لێی ڕازی بێ) كە بۆ ماوەی دە(10) ساڵ لە خزمەتی پێغەمبەردا بووە، دەڵێ: تەمەنم (10) ساڵان بوو دایكم بردمی بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەنەس كوڕێكی وریایە، بۆیە هێنام تاكو خزمەتت بكات وە لە تۆشەوە فێری خووڕەوشتی جوانو دینداریی بێ، جا (أنس) دەڵێ: ئنجا من بۆ ماوەی دە (10) ساڵ لە خزمەتی پێغەمبەردا بووم، ڕۆژێكیان كە نانم دەخوارد، سەرەتا -بسم الله- م نەكرد، و پاشانیش لەكاتی نان خواردنیشدا دەستم لە قاپەكەدا دەگێڕاو بەدەستی چەپیش نانم دەخوارد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (يا غلامُ سَمِّ الله وكُلْ بيمينك وكل مِمّا يليك) (متفق عليه)، واتە: ئەی ڕۆڵەگیان ناوی خوا بێنەو بەدەستی ڕاستت بخۆو لەپێش خۆتەوە بخۆ، بە یەك ڕستە سێ ئەدەبی بەرزی فێری ئەنەسو هەر مسوڵمانێكیش كردوە كە چاو لە ئەدەبی پێغەمبەر ﷺ دەكات، كە چی ئێستانی وا هەیە بڕوانامەیەكی بەرزی لە ئەورووپا هێناوەتەوە، بەڵام ئێستاش ئەو ئەدەبانەی تێدا نین! بۆچی؟! چونكە پێغەمبەر ﷺ ی نەكردۆتە سەر مەشقی خۆی، كابرا خاوەن بڕوانامەیەكی بەرزە بەڵام بەدەستی چەپی دەخوات! ئاخر دەستی چەپ تارەتی پێ دەگیرێ، چۆن دەگونجێ نانی پێ بخورێ؟! یان بابای وا هەیە كە بەدەستی چەپ سەلام لە خەڵك

دەكات! لەكاتێكدا كە دەستی چەپ بۆ سەلام كردنێ نیە! دایكمان (عائیشە) (خوا لێی ڕازی بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ دەستی ڕاستی بۆ ئاو هەڵگرتن‌و نان خواردن بوو، دەستی چەپیشی بۆ تارەت گرتن‌و شتی دیكەی پیس بوو، كە مەبەستی پێڵاوو نەعل هەڵگرتن‌و ئەو جۆرە شتانەیە! ((كانت يد رسول الله اليمنى لطهوره وطعامه وكانت اليسرى لخلائه وما كان من أذى)) (رواه أبوداود عن عائشه بأسناد صحيح).

مەبەستم ئەوەیە كە ئێمە هەتا لە خووڕەوشت‌و ئاكارو هەڵس‌و كەوتی پێغەمبەر ﷺ ورد بینەوەو پێی ئاشناتر بین، باشتر دەتوانین دەست بگەیەنینە هەرچی ڕەوشتی بەرزو جوانە، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ خاوەنی چاكترین‌و جوانترین ڕەوشت بووە، وەك (أنس) (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: ((كان رسولُ الله ﷺ أحْسَنَ النَّاسِ خُلُقاً)) (رواه البخاري ومسلم).

## سێیەم: پاراستنی تەمەن و ئەندامەكان‌و سامان و زانست:

یەكێكی دی لە هۆكارەكانی وەدەستهێنانی ڕەوشتی بەرزو پەسند، ئەوەیە كە ئێمە تەمەنی خۆمان‌و ئەندامەكانمان‌و ماڵ‌و سامانمان‌و زانیاریمان لە ڕێی ناشەرعیدا بەهەدەر نەدەین، لەوبارەوە پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەكیدا كە (ترمذي وطبراني) هێناویانە دەفەرموێ: (لا تزولا قدما عبد حتى يسأل عن أربع: عن عمره فيما

أفناهُ وعن علمه ماعمل فيه وعن ماله من أين اكتسبه وفيما أنفقه وعن جسمه فيما أبلاه)، واتە: ڕۆژی دوایی هیچ كەس دوو پێی بەملاو لادا نارۆن‌و ناجوولێ هەتا لە چوار شتان پرسیاری لێ نەكرێ: لە تەمەنی كە لە چیدا بەڕێی كردوە، لەو زانیاریەی كە پێی بووە چەندی ئیش پێی كردوە، وە لەو ماڵ‌و سامانەی كە هەیبووە چۆن پەیدای كردوەو چۆنی خەرج كردوە، وە لە جەستەی كە لەچی‌و چیدا پیری كردوەو بەكاری هێناوە؟! جا هەر كە سێك ئاگاداری ئەو چوار شتانە بێ، بێگومان ڕەوشتی بەرزو جوان دەبێ، ئاگای لە ساتەكانی تەمەنی بێ، وە ئاگاداری ئەو زانیاری‌یەبێ كە پێ‌یەتی داخۆ لە چیدا بەكاری دێنێ، وە ئاگای لەماڵ‌و سامانی بێ بە شێوەیەكی شەرعی بەدەستی بێنێ‌و بە شێوەیەكی شەرعیش سەرفی بكات، هەروەها ئاگاداری ئەندامەكانی بێ بە شێوەیەك كە لە فەرمانبەریی خوادا نەبێ بەكاریان نەهێنێ.

## چوارەم: لێپرسینەوە لەگەڵ خۆدا كردن:

یەكێكی دی لە هۆكارەكانی وەدەستهێنانی خوورەو شتی بەرزو پەسند بریتیە لە لێپرسینەوە لەگەڵ خۆدا كردن، یانی مرۆڤ هەروا ڕێشمە بۆ نەفسی خۆی بەرهەڵنەدا، بەجۆرێك كە هەر چی حەزی لێكردو پێی خۆش بێ وابكا![1] وەك پێغەمبەر ﷺ دە فەرموێ: ((الكَيِّس من دان نفسهُ وَ عَمِلَ لما بَعدَ الموت، والعاجز من أتْبَعَ

(1) شاعیرێك جوانی گوتوە: ( ومن أباح النفس ماتهواه    فأنما الهه هواه )

نَفْسَهُ هواها وتَمنَّى على الله الأماني)) (رواه الترمذي)، واته: ئینسانی عاقڵو تێگەیشتوو کەسێکە لێپرسینەوە لەگەڵ خۆیدا دەکاتو بۆ دوای مردنیش ئیش دەکات، ئینسانی تەمبەڵو هیچ لەدەست نەهاتووش کەسێکە نەفسی بەدوای ئارەزووەکان دەخات، ئنجا خۆزگەش لەسەر خوا دەخوازێ، بۆ نموونە دەڵێ: (خوا بەرەحمە تۆ بڵێی خوا لێمان خۆش نەبێ؟!!).

## پێنجەم: دۆستو هاوەڵی باش:-

یەکی دیکە لەو هۆکارانە بریتیە لە دۆستو هاوەڵی باش، زۆر جاران دۆستو هاوەڵی باش باشترین هۆکارە کە ئینسان خووڕەو شتی چاکی لێوە فێر دەبێ وەك چۆن بە پێچەوانە شەوە ڕەفیقو هاوەڵی خراپ، هۆکارێکی زۆر ماڵ وێرانکەرو زیان بەخشەو ئینسان تووشی خووڕەوشتی خراپ دەکات، بە تایبەت مرۆڤ کە تازە دەگاتێ، فیطرەتێکی پاكو چاکی هەیەو بیر لەکاری خراپ ناکاتەوە، بەڵام لەناکاو کە ڕەفیقێکی خراپی لێ هەڵدەکەوێ دەبینی تووشی زۆر کاری خراپی دەکاتو دەیخلیسکێنێو لەسەر گوناحو تاوان هانی دەدات، جا گوناحو تاوانیش وەك سەرەو ژێرێکی خلیسکی لووس وایەو هەر کە لێی هەڵخلیسکای کەم وایە خۆت بۆ بگیرێتەوە!

لە سەفەری ئەمجارەماندا لە بەریتانیا هەندێ گەنجم دەبینین لەدڵەوە گریانم بۆیان دەهات کە بەبێ هۆشیی یان خەوتوویی لەسەر شەقامەکان یان لەنێو کۆڵانەکاندا کەوتبوون، پرسیارم کرد، گوتم:

ئەوانە چین؟! گوتیان: فلاَن كەس ئەوانە لێ بوونەوە! منیش گوتم لە چی بوونەوە؟! گوتیان: ئەوانە (موعتادن)و مادده سەرخۆشكەرەكانی وەك، تریاكو هیرۆین و... هتد بەكار دێنن، ئیدی هەر بە گەنجی لە تەمەنی (20-30) ساڵیدا، دادەڕزێن، یەكێكیانم بینی خۆی پیس كردبوو گوتم: باشە ئەوە شارەوانی شوێنیكی بۆ ئەوانە دیاری نەكردوە؟!! گوتیان: با، شوێنی دیاریكراویان هەیە، هەموو جارێ دەبرێنە ئەوێو پاك دەكرێنەوەو خزمەت دەكرێن، بەلاَم هەر دێنەوە ئێرەو ئاوا دەگەڕێنو قونچكە جگەرە هەڵدەگرنەوە، یان سواڵ دەكەن، بەڵكو كەسێك پارەیەك شتێكیان بداتێو بە ماددەی بێهۆشكەری بدەن! كەواتە: وەك چۆن هاوڕێی خراپ زۆر زیان بەخشە، بە هەمان شێوەش هاوڕێو هاوەڵی باشیش زۆر بەكەڵكە.

ئێستا با سەرنج بدەین داخۆ پێغەمبەر ﷺ بە شێوەیەكی چەند جوان كاریگەری دۆستو ڕەفیقی چاكو خراپمان بۆ بەیان دەكات، وەك دەفەرموێ: ((مثل جليس الصالح وجليس السوء كحامل المسك ونافخ الكير...)) (رواه مسلم)، واتە: هاوڕێی چاكو هاوەڵی خراپ وەك بابای عەتر فرۆشو كوورەچی وایە. دوایی ڕوونی دەكاتەوەو دەفەرموێ: بابای عەتر فرۆش یان لێی دەكڕی یان تۆزێكت تێدەدا، (ئنجا ئەگەر عەتریشت نەداتێ بەلای كەمەوە بۆنی خۆشت بۆ دێ).

واتە: هاوەڵی باش ئەگەر هیچیشت فێر نەكات لە سۆنگەی ئەوەوە كە لەگەڵی دەگەڕێی هەر لێی بەهرەمەند دەبی، چونكە بەلای كەمەوە خەڵكی گومانی باشت پێ دەبەنو بە چاكە باست دەكەن، دەڵێن فلاَنكەس دیارە كەسێكی چاكە بۆیە فلاَنكەسە كە

ئینسانێکی چاکە هاوەڵی دەکات، وە دەفەرموێ: بەڵام با بای کوورەچیو ئاسنگەر ئەگەر بە پری شکە ئاگرەکانی شی پۆ شاکت نەسووتێنێ، ئەوە بە تەقەتەقێ جاڕزو بێزارت دەکات، هەروەها هەر دەربارەی دۆستو هاوەڵ، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ((... یح شر المرءُ علی دین خلیلـه فلینظر أحدکم من یخالل)) (رواه الترمذي وأبوداود)، واتە: مرۆڤ لەسەر ئاینی دۆستو خۆشەویستەکەی حەشر دەکرێ. کەواتە با هەرکامێکتان باش سەرنج بدات دۆستایەتی کێ دەکات!

## شەشەم: پەند وەرگرتن (الأتّعاظ)

هۆکارێکی دیکەی کاریگەر بۆ وەرگرتنی خووڕەو شتی بەرزو جوانو خۆپاراستن لە خوو خدەی ناشیرین، ئەوەیە کە ئینسان دەرس و پەند لە عەیبو هەڵەی خۆیشیو غەیری خۆیشی وەربگرێو ئەوەی کە جارێك پێی ناشیرین بووەنەیکاتەوە بە دووجارو سێجار، وە هەر شتێك کە غەیری وی پێ زەرەرمەند بووە لە قسەی هەڵەو ناجۆرو ڕەفتارە هەڵسوکەوتی نارێكو ناشیرین، ئەو خۆی لێ بپارێزێو عیبرەتو پەندی لێ وەربگرێ، چونکە وەك گوتراوە: (السعید من اتعظ بغیره) بەختەوەر کەسێکە پەند لە غەیری خۆی وەربگرێ، خوای کاربەجێش ڕای گەیاندوە کە خاوەن عەقڵان پەندو عیبرەت لە هەڵەو پەڵەی غەیری خۆیان وەردەگرن، چونکە لە سەرەتای سووڕەتی (الحشر)دا پاش ئەوەی باسی سەرەنجامی شوومی تیرەی (بنو النضیر)ی جوولەکە دەکات کە بەهۆی بێبەڵێنییو پەیمان

شکێنیی یەوە گیــرۆدەی بوون، دەفەرموێ: ﴿... فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ﴾ (الحشر-2)، واتە: دەجا پەند وەربگرن ئەی خاوەن بینایان!.

بەڵــێ پەندو دەرس وەرگرتنی ئینسان لە هەڵەو کەموکووڕیی‌و ڕەفتاری نا هەمواری خۆی‌و خەڵکی هۆکارێکی گرنگی خۆڕازاندنەوەیەتی بە خەسڵەت‌و ڕەوشتی بەرزو پەسند، هەر بۆیەش لە (لقمان)ی حەکیم گێڕراوەتەوە کە گوتویەتی: من لە بێ‌عەقڵانەوە فێری عەقڵ بووم‌و لە ناشێ‌یانەوە فێری حیکمەت بووم، چونکە ئەوانم دەبینی چۆن بە ڕەچاونەکردنی عەقڵ‌و ئەدەب‌و حیکمەت ناشیــرین دەبن، منیش پەندم لــێ وەرگرتن‌و وەك وانم نەکرد!!

## حەوتەم: چــاولـێکردنـی چاکــان:

وەك چۆن دەرس‌و پەندوەرگرتن لە خراپان یەکێکە لە ڕێگەیەکانی وەدەستهێنانی ڕەوشت‌و ئەدەبی بەرزو جوان، بە هەمان شێوەو بگرە لەپێشتــریشدا چاولێکردن‌و شوێن پێ هەڵگرتنی چاکەکارانیش‌و ڕەوشت‌و ئەدەبی بەرزو جوان لێوە فێربوونیان، ڕێگاو هۆکارێکی گەورەو گرنگی وەدەستهێنانی خووڕەوشتی بەرزو خۆڕازاندنەوە بە خەسڵەتە بەرزو چاکەکانە، هەر بۆیەش خوای زاناو شارەزا (تبارك و تعالى) فەرمانی بە پێغەمبەری کۆتایی ﷺ خۆی کردوە کە پێغەمبەرانی پێش خۆی (عليهم الصلاة والسلام)و ئاکارو هەڵوێستە ڕەندو پەسندەکانیان بکاتە سەرمەشق! بۆ نموونە: لە سوورەتی(الانعام)دا دوای ئەوەی ناوی هەژدە (18) لە پێغەمبەرانی

خۆی دێنێ کە: ((ابراهیم، أسحاق، یعقوب، نوح، داود، سلیمان، أیوب، یوسف، موسی، هارون، زکریا، یحیی، عیسی، الیاس، اسماعیل، الیسع، یونس، لوط))ن (علیهم الصلاة والسلام)، پێی دەفەرموێ: ﴿أُوْلَـئِكَ الَّذِينَ هَدَى اللّهُ فَبِهُدَاهُمُ اقْتَدِهْ...﴾ (الانعام-89)، واتە: ئەوانە کەسانێکن کە خوا ڕێنمایی کردوون، دەجا تۆش شوێن ڕێنمایی‌و ڕێبازی وان بکەوەو بیانکە سەرمەشق، دیارە شوێن پێ هەڵگرتنی پێشینەی چاك (السلف الصالح)یش هەر لە سەر ئەم بناغەو ئە سڵە بنیات نراوە، چونکە بێگومان مەبەست لە شوێنکەوتن‌و شوێن پێ هەڵگرتنی پێشینەی چاك ئەوەیە کە لە چاکەکانیانداو لە خووڕەشت‌و ئەدەبی بەرزو پەسندیاندا بیانکەینە سەرمەشقمان، ئەگەرنا بێجگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ کەس پێشڕەوو سەرمەشقی ڕەها (القدوة المطلقة)نیە، بەڵکو وەك (مالك) (خوا لێی خۆش بێ) گوتویەتی لەکاتی ئاماژەکردنیدا بە گۆڕی پێغەمبەر ﷺ: ((کل یؤخذ منه ویرد علیه الا صاحب هذا القبر)) بێجگە لە خاوەنی ئەم گۆڕە هەموو کەس قسەی لێ وەردەگیرێ ئەگەر هەق‌و ڕاست بێ‌و - بەسەریشیدا دەدرێتەوە - مادام هەڵەبێ، هەڵبەتە ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەریش ﷺ: (أذکروا محاسن موتاکم وکفوا عن مساوئهم)[1]، واتە: چاکەی مردووەکانتان باس بکەن‌و لە خراپەکانیان بگەڕێن، (چونکە بەرەو بەرهەمی ئەو کردەوانەیان چوونە کە پێشیان خستوون‌و ئەنجامیان داون) پێویستە

(1) رواه ابوداود والترمذي والحاكم والبيهقي ورمز السيوطي لصحته .

هەر لەسەر ئەو بناغەیە فام بکرێ، لە کۆتایی ئەم باسەشدا دە لێم: بێگومان هەموو ئەو هۆ کارو ڕێیا نەی ل یرەدا با سمان کردن، پەیوەندییان بە تاکەوە هەیەو هەموو ئینسانێك لە خودی خۆ یدا دەتوانێ لەم حەوت ڕێیەوە دەست لە ڕەوشتە بەرزو ئەدەبە پەسندەکان گیر بکات، ئەگەر نا کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامیش ڕۆڵێکی یەکجار گرنگ‌و کاریگەر دەگێڕێ لەو بوارەدا، چونکە یەکێك لە ئەر کە گرنگ‌و بنەڕەتیەکانی کۆ مەڵگاو دەو ڵەتی ئی سلامیی ئەوە یە هەوڵبدات هەرچی چاکەیە (معروف) لە بواری خووڕەوشت‌و غەیری ئەویشدا بیچەسپێنن‌و هەرچی خراپەشە(منکر) ڕیشە کێشی بکەن، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ الَّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ﴾ (الحج -41)، واتە: ئەوانەی کاتێك دەسەلاتمان پێدان لە ولاتدا، نوێژ بەرپا دەکەن‌و زەکات دەدەن‌و فەرمان بەچاکە دەدەن و ڕێ لە خراپە دەگرن، وە سەرەنجامی کارەکان هەر هی خوایە.

بەڕێـــزان!

خووڕەوشتی بەرزو پەسند زۆرو جۆراو جۆرن و سەرژمێرکردنیان ئەگەر مەحاڵیش نەبێ کارێکی ئا سان نـیە، چونکە لەڕا ستیدا خەسڵەتە پەسندو جوانەکان و ڕەوشت و ئەدە بە بەرزەکان، بە سەر سەرجەم هەڵس و کەوتەکانی ئینـ سان و لا یەن و بوارە کان ژ یان و گوزەرانیدا دابەش دەبن و پەیوەندییان بە هەموو ک یانی مرۆ ڤەوە هەیە بە دەروون و دەر (باطن و ظاهر) یەوە، ئێ ستاش ئە گەر زۆر بەکورتیش بووە، با ئاماژە یەك بە بوارو جۆرە سەرەکییەکانی خووڕەوشتی بەرزو پەسند بکەین:

یەکـەم: بـواری تاکـیـی

مەبەست لە خووڕەوشتی تاکیی ئەوەیە کە ئینسان دەبێ لەخودی خۆیدا کۆمەڵێك خەسڵەتی چاك بێنێتەدی بێ ئەوەی کە پەیوە ندی یان بە خەڵکەوە هەبێ، وەك لە( صحیح المسلم)دا هاتوە، کە کابرایەکی کافر بە ناوی (أشبح عبدالقيس) دەچێتە لای پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی مسوڵمان ببێ، پێغەمبەریش ﷺ لێی دەپر سێ: بۆچی لە ڕەفیقەکانت دواکەوتی؟! ئەویش دەڵێ: ئەوەی ڕا ستی بێ ئەوان پەلەیان کرد هاتنە خزمەتت، بەڵام من تۆزو خۆڵی ڕێ گام پێوەبوو، بۆیە حەزم نەکرد بە تۆزو خۆڵو ئارە قەی ڕێ گاوە بێ مە

خزمەتت، ئەوەبوو لامداو خۆم شۆردو بەرگەکانم گۆڕیوخۆم بۆنخۆش کرد تاکو لایەق بێ بێمە خزمەتت تۆ، ئینجا پێغەمبەر ﷺ تەماشایەکی کردو فەرمووی: ((ان فيك خصلتين يحبهما الله ورسوله الحلم والأناة)) واتە: تۆ دوو ڕەوشتت تێدان کە خواو پێغەمبەرەکەی خۆشیان دەوێن: هێدیی‌و مەندیی‌و پەلە نەکردن، دیارە ئەو گفتوگۆیە لە کاتێك دایە کە کابرا جارێ هەر کافرەو مسوڵمان نەبووە، ئەویش دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەو دوو ڕەو شتە بۆ خۆم پەیدام کردوون یان خوا تێیدا داناوم، ئەویش فەرمووی: هەر خوا (عزّو جلّ) تێیدا داناوی[1]، جا ئەو خەسڵەتە چاکانەی کە خوای پەروەردگار لە سروشتو فیطرەتی ئینساندا دایناون، لە سەری پێویستە کە پارێزگاریان لێ بکاتو گەشەشیان پێ بدات، وەك چۆن لەسەریشی پێویستە کە ئەو سیفەتو خەسڵەتە خراپانەی تێدا دانراون کۆنترۆڵیان بکاتو بگرە خۆیان لێ بژار بکات، وەك خوا (سبحانەوتعالى) فەرموویەتی: ﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا ۞ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ۞ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا﴾ (الشمس 7-9).

(1) کە گەڕامەوە بۆ (صحيح مسلم) تەنیا ڕستەی: (ان فيك خصلتين يحبهما الله ورسوله الحلم والأناة)م تێدا بینی، دیارە وتووێژەکەی دیکە لە شوێنێکی دیکەدا هاتوەکە ئێستا لە یادم نیە چ سەرچاوەیەکە.

دووەم: بواری هەڵس و کەوت لەگەڵ خوای بێوێنەدا:

لە بواری هەڵس و کەوت لە گەڵ خوای بەدیهێنەرو خاوەن و پەروەردگاریدا کۆمەڵێك ئاکارو ڕەوشتی گرنگ و بنەڕەتی هەن کە پێویستە مرۆڤ خۆییان پێ برازێنێتەوە، بۆنموونە:

1) ئیمان پێ هێنانی: ﴿وَمَا لَكُمْ لَا تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ﴾ (الحديد-8) .

2) بەپاك گرتنی و ستایشکردنی: ﴿فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ..﴾ (النصر-3).

3) بانگ کردنی و لێ پاڕانەوەی بەناو سیفەتە هەرە چاکەکانی: ﴿وَلِلّهِ الأَسْمَاء الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا﴾ (الاعراف-180) .

4) خۆشویستنی لە هەموو کەسێك و شتێك زیاتر: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبّاً لِّلّهِ﴾ (البقرة- 165).

5) پشت پێ بەستنی: ﴿ إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَعَلَيْهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُتَوَكِّلُونَ﴾ (يوسف-67).

6) لێترسانی لە هەموو کەس و شتێك زیاتر: ﴿.. فَلاَ تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ (آل عمران-175 )، ﴿..فَاللّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَوْهُ إِن كُنتُم مُّؤُمِنِينَ﴾ (التوبة -13).

7) سوپاسکردنی لەسەر نیعمەت و چاکە لەژمێر نەهاتوەکانی: ﴿وَلِتُكَبِّرُواْ اللّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ (البقرة- 185).

8) بەندایەتی بێخەڵەتە بۆکردنی و پشت پێبەستنی و هاوار تێبەستنی: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۞ اهدِنَــا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ﴾ (الفاتحة-5).

9) بەدەم فەرمانەکانییەوە چوونی: ﴿اسْتَجِيبُوا لِرَبِّكُم﴾ (الشورى-47).
10) فەرمانبەریی کردنی خۆیو پێغەمبەرەکەی: ﴿قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ﴾ (النور-54).

شایانی باسیشە هەرکەسێك بەمانای وشە زانی چۆن لەگەڵ خوای پەروەردگاریدا مامەڵەو هەڵسو کەوت دەکات دەشزانێ چۆن لەگەڵ بەندەکانی خواشدا ڕەفتار دەکاتو هەرکەسێك لەگەڵ خوادا ڕا ست بوو، لەگەڵ خەڵکی خواشدا چاك دەبێت، بۆیەش خوا فەرموو یەتی: ﴿فَاتَّقُواْ اللّهَ وَأَصْلِحُواْ ذَاتَ بِيْنِكُمْ﴾ (الانفال-1)، واتە: جا پارێز لەخوا بکەنو پەیوەندی نێوانتان چاك بکەن.

سـێیەم: بـواری خێـزان:

هەروەها بەشێك لە خووڕەوشتی پەسندو جوان کە شەریعەتی خوا فەرمانی بە مسوڵمانان کردوە پێیەوە پابەند بن پەیوەندی بە بواری ماڵو خێزانەوە هەیە، چ ژنو مێرد لە گەڵ یەکد یدا، وە چ باب‌و دایكو ڕۆڵەکانیان لەگەڵ یەکتریدا.

جادیارە ئێمە لێرەدا نەدەمانەوێو نە دەرفەتیشمان هەیە کە نەك بە تێرو تەسەلـی بگرە بە نیوەچڵییش باسی ئەم مەسەلەی ب کەین، بۆیە بە ئاماژەیەکی کورت وازی لـێ دێنینو دەڵێین: بۆ نموونە: خوای پەروەردگار بە پیاوان دەفەرموێ: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ﴾ (النساء-19). واتە: وە لەگەڵ هاوسەرەکانتاندا بەچاکە مامەڵە بکەن، هەروەها بە

ئافرەتانیش دەفەرموێ: ﴿فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللّهُ﴾ (النساء-34)، یانی: ئافرەتانی چاك ئەوانەن كە بەقسەی مێردیان دەكەن (لە سنووری شەرع)دا وە لەكاتی لە ماڵ نەبوونیاندا ماڵو كەرامەتو نهێنییەكانیان دەپارێزن.

## چوارەم: بواری كۆمەڵایەتی:

هەندێك خووڕەوشتیش هەن لە چوار چێوەی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكاندا وەك: خووڕەوشتی جوانی ئینسان لەگەڵ باب‌و دایكی، لەگەڵ خزمانی، لەگەڵ دەرو دراوسێ‌و میوان، لەگەڵ نەدارو هەژارو پەككەوتەو ڕێبوار، لەگەڵ دۆست‌و برادەرو خەڵكی... هتددا، بۆ نموونە خوای بەرزو بێوێنە فەرموویەتی: ﴿وَاعْبُدُواْ اللّهَ وَلاَ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئاً وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً وَبِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَالْجَارِ ذِي الْقُرْبَى وَالْجَارِ الْجُنُبِ وَالصَّاحِبِ بِالجَنبِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالاً فَخُوراً﴾ (النساء - 36)، واتە: وە خوا بپەرستن‌و هیچ شتێكی مەكەنە هاوبەش، وە چاكە لەگەڵ دایك‌و بابتان بكەن، وە لەگەڵ خزمان‌و هەتیوان‌و هەژاران‌و دراوسێی نزیك‌و دراوسێی دوورو هاوەڵی نیزیك‌و ڕێبوارو بەردەستەكانتان، بێگومان خوا كەسێكی خۆش ناوێ كە فیزو دەمارو كەشخەكەر بێت.

پێنجەم: بـواری سیاسـی:

بواری سیاسیش کۆمەڵە ڕەوشتێکی پە سندی تـێدا بە مەرج گیـراون، بۆ نموونە: لە بواری سیاسیدا خوای داد گەرو کار بەجێ، فەرمان بە مسوڵمانان دەکات و دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَوْفُواْ بِالْعُقُودِ﴾ (المائدة -1)، واتە: ئەی ئەوانەی بڕوا تان هێناوە وە فا بە پەیمانتان بکەن یانی: - پەیمانەکانتان مەشکێنن- بەڵێ مە سوڵمان دەبێ لەبواری هەڵس و کەوت لە گەڵ دۆ ست و دوژمنیشدا ڕا ست بکات و نابێ بە هیچ شێوەیەك ئەهلی غەدرو خیانەت بێت، هەروەها کۆمەڵێك ئەخلاقی بەرزی دیکە هەن لە بواری سیا سیدا، کە پێویستە مسوڵمانان خۆیانیان پێ بڕازێننەوە.

شەشـەم: بـواری ئابـووری:

دیسان بە هەمان شێوە لە بواری ئابووریدا کۆمەڵێك خووڕەوشتی پەسند هەن کە پێویستە ئینسانی مسوڵمان و خەڵکی مە سوڵمان خۆیان پێ بڕازێنێتەوە، وەك:

1/ ماڵ و سامان کردنە وەسیلەی پاداشتی ڕۆژی دوایی: ﴿وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ...﴾ (القصص -77).

2/ ماڵ و سامان بەخشین لە ڕێی خوادا: ﴿وَأَنفِقُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾ (البقرة -195).

3/ میانجی بوون لە خەرج كردن‌و بەخشینداو نەدەست بلاویی‌و نە چەنگ قوچاویی: ﴿ وَلاَ تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَى عُنُقِكَ وَلاَ تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ.. ﴾ (الاسراء-29).

4/ پێوان وكێشان بەتەواویی و بە شێوەیەكی دادگەرانەو دوور لەفێڵ‌و تەرازوو بازیی: ﴿ وَأَوْفُوا الْكَيْلَ إِذا كِلْتُمْ وَزِنُواْ بِالقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ... ﴾ (الاسراء-35).

5/ بەزەوی داگەڕان وسووڕان‌و هەوڵدان بۆ وەدەستهێنانی بژێوو ڕۆزی پاك وچاك: ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِن فَضْلِ اللَّهِ... ﴾ (الجمعة -10).

## حەوتەم: بواری جەنگ وجیهاد بەڕێی خوادا:

لە بواری جەنگ‌و جیهادیشدا وەك هەموو بوارو لایەنەكانی دیكەی ژیان‌و گوزەران شەریعەتی خوای كاربەجێ چەند ڕەو شت‌و ئاكارێكی بەرزو پەسندی بۆ مسوڵمانانی جەنگاوەر دیاری كردوە كە پێیانەوە پابەند بن‌و لە چەند هەڵس‌و كەوت‌و ڕەفتارێكیش قەدەغەی كردوون، وەك لەم ئایەت‌و فەرمایشتانەدا دەبینرێ:

1- ﴿ وَقَاتِلُواْ فِي سَبِيلِ اللّهِ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبِّ الْمُعْتَدِينَ ﴾ (البقرة -190).

أ/ ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ قَاتِلُواْ الَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ الْكُفَّارِ وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً وَاعْلَمُواْ أَنَّ اللّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴾ (التوبة -123).

ب/ عن سليمان بن بريدة عن أبيه قال: كان رسول الله ﷺ اذا أمَّر أميراً على جيش أو سرية أوصاه في خاصته بتقوى الله (عزّو جلّ) ومن معه من المسلمين خيراً، ثم قال: أغزو باسم الله، في سبيل الله، قاتلوا من كفر بالله، أغزوا فلا تَغُلُّوا ولا تغْدِروا ولا تَمثُلُوا ولا تقتلوا وليداً...) (رواه مسلم).

2- عن عبدالله أن أمرأة وجدت في بعض مغازي رسول الله ﷺ مقتولة فأنكر رسول الله ﷺ قَتْلَ النِّساء والصِّبيان) (متفق عليه).

3- من رباح بن ربيع قال: كنا مع رسول الله في غزوة فرأى الناس مجتمعين على شيء، فبعث رجلاً فقال: أنظر علامَ اجتمع هؤلاء؟! فجاء فقال: على امرأة قتيل، فقال: ماكانت هذه لتقاتل، قال: وعلى المقدمة خالد بن الوليد، فبعث رجلاً، فقال: قل لخالد: لايقتلن آمرأة ولا عسيفاً) (رواه أبوداود).

4- عن حمزة الأسلمي أن رسول الله ﷺ أمَّره على سريةٍ، قال فخرجت فيها، وقال: انْ وجدتم فلاناً فأحرقوه بالنار، فولَّيْتُ فناداني فرجعت اليه، فقال: ان وجدتم فلاناً فاقتلوه ولاتحرقوه، فأنه لايعذب بالنار اُلأرَبُّ النــار) (رواه أبوداود).

ئەم ئایەتو فەرمایشتانەش چەند ئەدەبو ڕەو شتێکی گرنگی ئیسلامیان گرتۆتە خۆ لە بواری جەنگو جیهاددا:

1) جەنگ‌و جیهاد دەبێ تەنها لە ڕێی خوادا بکرێ: ﴿وقاتلوا في سبيل الله..﴾ ﴿ أغزوا باسم الله، في سبيل الله..﴾.

2) جەنگ تەنها دژی ئەوانە بەرپا دەکرێ کە جەنگ لە دژی ئیسلام‌و مسوڵمانان دەکەن‌و دەیانەوێ دەستدرێژییان بکەنە سەر: ﴿وقاتلوا في سبيل الله الذين يقاتلونكم ولاتعتدوا...﴾.

3) پێویستە فەرماندەی جەنگاوەرانی مسوڵمان پارێزکار بێ‌و لەگەڵ موجاهیدان خۆش ڕەفتار بێت: ﴿أو صاهُ في خا صته بتقوى الله (عزّو جلّ) ومن معه من المُسْلِمين خيراً ﴾.

4) نابێ دزیی لە دەستکەوتی جەنگی بکرێ: ﴿فلا تغلوا﴾.

5) نابێ پەیمان شکێنیی لەگەڵ دوژمن بکرێ: ﴿ولاتغدروا﴾.

6) نابێ جەستەی کوژراوانی دوژمن بشێوێنرێ: ﴿ولا تَمثّلُوا﴾.

7) دروست نیە منداڵی دوژمن لە جەنگدا بکوژرێ: ﴿ولاتقتلوا وليداً﴾.

8) دروست نیە ئافرەتی دوژمن لە جەنگدا بکوژرێ: ﴿ فأنكر رسول الله قتل النساء والصبيان﴾.

9) دروست نیە باباى کرێکار بکوژرێ: ﴿لايقتلن امرأة ولا عسيفاً﴾.

10) دروست نیە هیچ کەس بە ئاگر سزا بدرێ‌و بسووتێنرێ: ﴿فأنه لايُعَذِّبُ بالنار الا ربُّ النار﴾.

هەڵبەتە جەنگ‌و جیهاد زۆر ڕەوشت‌و ئەدەبی دیکەشی بۆ دانراون بەڵام ئێمە تەنها مەبەستمان ئاماژەبوو، وە ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە بوو کە خووڕەوشتی پەسند لە ئیسلامدا جۆری زۆرن‌و بۆ هەموو بوارو لایەنەکانی ژیان‌و گوزەرانی تاکیی‌و خێزانیی‌و کۆمەڵایەتیدا دابەش دەبن‌و کاتێکیش مرۆڤی مسوڵمان بە مانای وشە ڕەوشت بەرزو ئاکار پەسند دەبێ، کە هەوڵی لەخۆدا بەرجەستەکردنی هەموو جۆرەکانی ڕەوشت‌و خووی پەسند بدات لە هەموو بوارەکاندا.

## لە کۆتایی دا:

ئێستاش پێم وایە بەم برە توێژینەوە یە دەر کەوت کە: ڕاستە خووڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانێتیو دینداریی یەو بۆ ئەوەی بزانین مسوڵمانێتیی یەکەمان چۆنو چەندە، دەبێ تەماشای خووڕەوشتمان بکەین، چونکە بەڕاستی خووڕەوشتی بەرزو پەسند پێوەرو تەرازوویکە کە مسوڵمانێتی ئێمەی پێ دەپێوریو دەکێشرێ، وە هەرگیز ناگونجێ مرۆڤ ئیمانی باشی هەبێو ڕەوشتی بەرزو جوانی نەبێ!! بۆچی؟! چونکە، ئینسان کاتێك ئیمانی باشی دەبێ کە پەیوەندی لەگەڵ خوا قایمو توندو تۆڵ بێ، وە تەنها کاتێکیش پەیوەندی لەگەڵ خوا توندو تۆڵ دەبێ کە خاوەنی هەموو ڕەوشتێکی بەرزو پەسندو جوان بێو لە هەموو کەموکوڕییەك بەدوور بێ، ئەگەرنا چۆن دەگونجێ تۆ ئیماندار بیو خاوەنی ڕەوشتی بەرز نەبی، یان لە ڕەوشتی دزێوو ناشیرین بەدوور نەبی؟!!.

یەکێك لە زانایان لەوبارەوە قسەیەکی جوانی هەیە، دەڵێ: تەماشای مانگ بکە کە لە خودی خۆیدا تەنێکی بێ شەوقو تاریکە، بەڵام چونکە هاوەڵی ڕۆژێیە تیشکی لێ وەرگرتوەو منەوەر بووە!

کەواتە ئێمەش ئەگەر لەگەڵ خوا بینو لە پێغەمبەریش نزیك بین بە تەئکید ئەو سیفەتە بەرزانەی پەروەردگار کە لەگەڵ ئینسان دەگونجێن، وە ئەو ڕەوشتە بەرزانەی پێغەمبەر ﷺ کەمو زۆر لە

ئێمەشدا دێنە دی، کەواتە: مادام خووڕەوشتی بەرزو پەسند ســەنگی مەحەکی مسوڵمانەتیی یە، دیارە خووڕەو شتی دز ێوو نا شیرینیش بەڵگەی دوورییە لە ئیسلام، بۆیە من ئامۆژگاری خۆم دەکەم، ئن جا هی هەر برا یان خوشکێکی مسوڵمان، کە با وریابیــن‌و با دڵن یابین بە ئەندازەی ئەوە کە خووڕەوشتمان جوان‌و بەرزو پەسند دە بێ، بەو ئەندازەیەش دە توانین ب ڵێین م سوڵمانین! ئە گەرنا کە سێك کە مسوڵمانان لە دەست‌و زمانی سەلامەت نەبن‌و دڵی پڕ بێ لە غەرەزو بوغزو ڕق‌و کینە بەرامبەر بە مسوڵمانان، یاخود کە سێك ما یەی سەر ئێشە بێ بۆ مسوڵمانان بێ‌گومان ناتوا نێ ب ڵێ: م سوڵمانی چاکم، وەك پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکیدا کە (بخاري و م سلم) هێناویانە دەفەرموێ: ((المسلم من سلم المسلمون من لسانه و يده))، واتە: مسوڵمان کەسێکە کە مسوڵمانان لە دەست‌و زمانی سەلامەت بن . هەروەها فەرموویەتی: ((المؤمن من أمِنهُ الناسُ على د مائهم وأموالهم)) (متفق عليه)، واتە: ئیمانداریش کە سێکە کە خەڵکی بیکەنە ئەمینداریی خۆ یان، وە ب توانن ماڵو نەف سی خۆ یانی پێ‌بسـپێرن.

جا خوا بە لوتف‌و کەرەمی خۆی یارمەتیمان بدات کە خۆمان بە هەرچی ڕەوشتی بەرزو جوانە بڕازێنینەوەو هەرچی ڕەو شتی دز ێوو ناشیرینە لە خۆماندا لایبەرین‌و خۆمانی لــێ بژار بکەین .

وَصَلَّى الله وسلم وبارك عَلى مُحَمَّد وآله أجْمَعِينْ وَالحَمْدُلله رَبِّ العالَمِين

# نێـوەرۆك

## لەم نامیلکەیەدا

لەم نامیلکەیەدا و لەشەش تەوەرەدا بەکورتی و پوختی باسی (خوورەوشت) کراوەو زۆر جوان رونکراوەتەوەو سەلمێنراوە ، کە بەراستی خوورەوشت رۆڵێکی یەکجار گرنگ لە ژیانی تاك و کۆمەڵ دا دەگێرێ و زۆر جێی خۆیەتی و قسەیەکی راست و پر بەپێستە ، کەبگوترێ:

(خوورەوشتی بەرز و پەسند ، سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتیی یە) وە: ( خوورەوشت و ئاکاری هەر مرۆڤێك تەرازوو و پێوەر و ئاوێنەی کەسایەتیی یەتی ).

عەلی باپیر





نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوەو راگەیاندن

www.al-tafseer.com
E-mail: tafseeroffice@yahoo.com
altafseer@hotmail.com

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت: 2518138 -2221695 - 2230908
موبایل: 07504605122 – 07701387291